عارف قوربانی



# نێرگز



## له دۆزەخی ئەنفالدا



2020

چاپی یەکەم

- ناوی کتێب: نێرگز لە دۆزەخی ئەنفالدا
- نووسەر: عارف قوربانی
- چاپی یەکەم : ٢٠٢٠
- پیتچنین: نوسەر
- دیزاین: ئارام شوانی
- هەڵەچنین و خاڵبەندی: بارام سوبحی
- چاپخانە: چاپخانەی حەمدی
- تیراژ: (٣٠٠٠)
- لە بڵاوکراوەکانی دەزگای یادەوەریی کورد

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ٢٠٠١ ) ی ساڵی ( ٢٠٢٠ ) ی پێدراوە

## پێشەکی

یادەوەریم یارمەتیم نادات لەوەی بە دیاریکراوی بزانم ڕۆژانی کۆتایی ساڵی (١٩٩٩) بوو یاخود سەرەتای ساڵی (٢٠٠٠)، بەڵام دەزانم لە هەفتە بۆ دە ڕۆژی نزیك بە سەری ساڵو ڕۆژێکی سەختی باراناوی بوو، ئەوکاتە بەرگی یەکەمی کتێبی شایەتحاڵەکانی ئەنفالم ئامادەکردبوو بۆ چاپ١، وەك پاشکۆیەك لە پەراوێزی کۆتایی کتێبەکەداو وەکو ئاماژەیەك بۆ بەردەوامیدانی ژیانی نەوەکانی ئەنفال، دەمویست ناوو وێنەی چەند کەسێك لەو منداڵانەی ئەنفال دابنێم کە لە زیندانی دوبز لە دایك بوو بوون.

بۆ وەرگرتنی زانیاری دەربارەی ئەو منداڵانە چوومە ماڵی ئەم خانمەی کە ئێستا کتێبەکەی لەبەردەستتدایە، وەك ژنە ئەنفالکراوێك لە زیندان مامانی لەدایکبوونی ئەو منداڵانە بووەو خۆیشی لە ڕۆژەکانی کۆتایی مانەوەیاندا لەو گرتووخانەیە منداڵێکی بووە.

لەوێ لە ماڵی خۆیان لە گەڕەکی پیریادییەکانی٢ ئۆردوگای شۆڕش٣، دیدارێکم لەگەڵیدا سازکرد. مەبەستی سەرەکی من وەرگرتنی زانیاری

---

[1] - شایەتحاڵەکانی ئەنفال زنجیرە کتێبێکی چوار بەرگی نوسەرە لە ٢٠٠١ تا ٢٠٠٧ چاپکراون

[2] - پیریادی گوندێك بوو لە باشوری ڕۆژهەڵاتی چەمچەماڵ، لە دروستکردنی ئۆردوگای شۆڕش بوو بەبەشێك لە ئۆردوگاکە و ناوی یەکێك لە گەڕەکە سەرەکییەکانی.

بوو دەربارەی ژمارەی ئەو ژنانەی لەوێ منداڵیان ببوو، هەروەها چارەنوسی منداڵەکانیشم دەویست. بەڵام هەستمکرد ئەم شۆڕەژنە دەبێت ووردتر لەگەڵیدا بدوێی، زانیارییەکانی، سەلیقەی گێڕانەوەی رووداوەکان، یادەوەرییەکانی، پێویستی بەوەبوو دەبێت دیدارێکی فراوانترو بۆ پرۆژەیەکی جیاوازتر بیدوێنمەوە.

بەڵێنم پێدا چاوپێکەوتنەکەی لەم زنجیرە کتێبەمدا (شایەتحاڵەکانی ئەنفال) بڵاونەکەمەوە، بەڵکو ئەگەر خوا تەمەنیدا جارێکی تر بێمەوەو کارێکی جیاوازی لەسەر بکەم.

چەند ساڵێك سەرقاڵی تەواوکردنی بەرگەکانی شایەتحاڵەکانی ئەنفال بووم، پرۆسەی روخانی رژێمەکەی سەدام[4] هاتە پێشەوەو لەگەڵ چەند هاوڕێیەکدا ئەرکی گرنگترم پێسپێردرا، بووین بە تیمی گەڕان بەدوای چارەنوسی ئەنفالکراوەکانو پاشان گەڕان بۆ دۆزینەوەی گۆڕەبەکۆمەڵەکان[5] کە ئەم کارەش ماوەیەکی زۆری ویست.

---

[3] - ئۆردوگای شۆڕش لە ساڵی ١٩٨٧ لە باشوری رۆژهەڵاتی قەزای چەمچەماڵ دروستکراوە. ٢کم لە ناوەندی چەمچەماڵەوە دوربوو، بەڵام ئێستا بەهۆی فراوانبوونەوەی هەردوکیانەوە سنورەکانیان گەیشتووە بەیەك. ساڵی ٢٠٠٠ کراوەتە ناحیە.

[4] - لە ٩ نیسانی ٢٠٠٣ بەسەرکردایەتی ئەمریکا هاوپەیمانی نێودەوڵەتی بە پرۆسەیەکی سەربازی کۆتایی بە دەسەڵاتی سەدام حوسێن هێنا.

٥ - لەگەڵ دەستپێکی پرۆسەی سەربازی بۆ روخانی بەعس لە ساڵی ٢٠٠٣ حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیدارەی سلێمانی دوو تیمی دروستکرد بۆ گەڕان بەدوای چارەنوسی ئەنفالکراوان، نوسەر سەرۆکی یەکێك لەو تیمانە بووە.

چوبووینەوە کەرکوکو وەك کارێکی پیشەیی‌و میدیایی لە هەمانکاتدا وەك ئەرکێکی حیزبی، ساڵانێکیش لەو بوارەدا کارمکردو ئەرکی دامەزراندنی دامەزراوەیەکی میدیایی کوردیی‌و بەڕێوەبردنیم پێسپێردرا[٦]. دواتریش پرۆژەی زنجیرە کتێبێکم خستە بەرنامەوە دەربارەی هەر یەك لە دەربازبووانی ناو گۆڕەبەکۆمەڵەکان[٧] و ئەمەش ساڵانێکی زۆری تەمەنمی پێویست بوو. بۆیە بەهۆی ئەو کارانەوە تەواوکردنی ئەم پرۆژەیە زۆر دواکەوت.

بەڵام هەر لە خەیاڵ‌و بیرکردنەوەمدا بوو کە دەبێت دەرفەتی ئەوە بدۆزمەوە لەپاڵ کاروباری رۆژانەو ژیانی تایبەتی‌و خێزانیمدا ئەم ئەرکەش بە ئەنجام بگەیەنم. دوای نزیکەی بیست ساڵ لە رۆژی (یەکی تشرینی یەکەمی ۲۰۱۹) چوومەوە خزمەتی‌و دیدارە نیوەناچڵەکەم لەگەڵیدا تەواوکرد. ئیتر دەبوو بەدوای دەرفەتی ئەوەشدا بگەڕێم کاتی گونجاوم هەبێت بۆ نوسینەوەو داڕشتنەوەی، دەشمزانی کاتی زۆری لێم دەوێت کە لێی دانەبڕێم‌و دەرفەتی ئەوەم هەبێت رۆژانە لانیکەم کاتژمێرێکی بۆ تەرخان بکەم. بەهۆی ئەوەشەوە کە ئێستا خێزانێکی بچکۆلانەمان پێکەوە ناوەو سێ منداڵم هەن کە هێشتا تەمەنیان بچووکەو لەوە ناگەن باوکیان ئەرکێکی گرنگتری لە ئەرکی باوکایەتی لە

---

٦ - لە ساڵی ٢٠٠٤ نوسەر لەسەر راسپاردەی مام جەلال ئەرکی دامەزراندنی تەلەفزیۆن و رادیۆ و چاپخانەیەکی لە کەرکوك پێسپێردراوەو دواتر کراوەتە بەڕێوەبەری.

٧ - لە پرۆسەی ئەنفالدا ٧ کەس لە گۆڕەبەکۆمەڵەکانی خوارویٔ عیراق رزگاریان بوو، لە ٢٠٠٣ بۆ ٢٠١٣ نوسەر سەرگوزشتەی ٥ لەو دەربازبووانەی لە ٥ کتێبدا چاپکردووە.

ئەستۆیە، بۆیە پێویست بوو باش خۆمی بۆ ئامادە بکەم، بە رەچاوکردنی بەخشینی کات بە منداڵەکانو دەرفەتی کارکردنیش لەم کتێبە کە لەڕووی کاتو لەڕووی دەرونیشەوە بۆ نوسینەوەی ئامادەبم.

دەمزانی دەست بۆ چی برینێکی سەخت دەبەم، بەتایبەتی بەهۆی ئەوەی کە پێشتر زۆر کارم لەسەر ئەنفال کردبوو، چی ئەوانەی برابونە تۆپزاوا[8] و دوبز[9] و نوگرەسەلمان[10]، ئەوانەش وا بەڕێککەوت لەناو گۆڕەبەکۆمەڵەکان رزگاریان بوو بوو، ئەزمونی ئەوەم هەبوو لەکاتی نوسینەوەو داڕشتنەوەیاندا خستبوومیانە چی دۆخێکی دەورنییەوە، ئەوەشم دەزانی ئەم کارە لەوانی تر قورسترو ئازاربەخشترە.

بڕیارمدا چەند مانگێکی تریش ئەم کارە دوابخەم تا دەگەینە شەوانی زستانو بەنیاز بووم ئەو وەرزەی ساڵی (٢٠٢٠) بۆ ئەم کارە تەرخانبکەم.

بەڵام زۆرجار قەدەر وادەکات مرۆڤ نەتوانێ ئەو پلانو بەرنامەیەی تەنانەت بۆ ژیانێکی ئاسایی داتڕشتووە وەکوو خۆی جێبەجێ بکەیت،

---

[8] - تۆپزاوا ناوی گوندێکە ١١ کم لە باشوری خۆرئاوای کەرکوک، بنکەیەکی مەشقی سەربازی عیراقی لێبووە، لە ساڵی ١٩٨٨ وەك کەمپی سەرەکی کۆکردنەوەی ئەنفالکراوان بەکاربراوە.

٩ -دوبز- دبس، قەزایەکە لە پارێزگای کەرکوك، لە ناوەندی قەزاکە سەربازکەیەکی سوپای عیراق وەك زیندان بەکاربراوە بۆ هێشتنەوەی نزیکەی ٢٥٠٠٠ ژن و منالی کورد بۆ ماوەی نزیکەی حەوت مانگ.

[10] نوگرەسەلمان لە ناوچە بیابانییەکانی سنوری نێوان عیراق سعودیە لە قەزای سەلمان سەر بە پارێزگای سەماوە لە شەستەکانی سەدەی رابردو دروستکراوە، لە ساڵی ١٩٨٨ بۆ ماوەی حەوت مانگ بۆ زیندانیکردنی ژن و منالو دەستگیرکراوە بەتەمەنەکانی ئەنفال بەکاربراوە.

چ جای ئەوەی پلانی کارێکی گرنگو جێی بایەخ بە دڵی خۆت ببەیتە سەر. لە ڕۆژانی کۆتایی ساڵو سەرەتای (٢٠٢٠) بە هۆکارێکی ناچاریی ڕوومکردە دەرەوەی کوردستانو چوومە ئەڵمانیا. بەڵام کەرەسە خامەکەی هەردوو چاوپێکەوتنەکەی ئەم بەرهەمەم لەگەڵ خۆم هێنابوو بەنیازی ئەوەی لێرە دەرفەت بۆ خۆم بڕەخسێنمو کاری لەسەر بکەم.

لەگەڵ گەیشتنم بە ئەڵمانیا بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی کۆرۆنا تەشەنەی کردو بوو بە هەڕەشەو مەترسی لەسەر ژیانی مرۆڤایەتیو هەموو ریسەکەی لە منیش کردەوە خوری. دوو مناڵە ساواکەم (کاریناو کاریزما) کە تەمەنی هەردوکیان کەمتر بوو لە ساڵو نیوێك، نەخۆشی لە سییەکانو لە قەسەباتی سینگیان هەبوو. ڤایرۆسی کۆرۆناش ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە سیەکانی مرۆڤەوە هەبوو، بۆیە بە دیاریکراوی بۆ ماوەی مانگێكو بیستو شەش ڕۆژ لە نەخۆشخانەیەکی تایبەت بە منالان ( UNIKLINIK KOLN klinik und poliklinik fur kindr-und jugendmedizin ) لە شاری (کوێلن) پێویست بوو ڕۆژانە لەژێر چاودێری پزیشکدا چارەسەر وەربگرن. ماوەیەکی زۆر کاتم بۆ ئەوە تەرخانکرد کە منداڵەکانم لە مەترسی بپارێزم. هەرچەندە هەر لەوکاتەدا (ساریزا) کچە گەورەکەم کە ئەوکات تەمەنی پێنج ساڵو هەشت نۆ مانگێك بوو ماوەیەك زۆر نەخۆش کەوت، ئەویش ماوەیە کاتی منی پێویست بوو تا چاك بوویەوە.

هێشتا هەر چارەسەریان وەردەگرت‌و تەواو دڵنیا نەبووبووینەوە لەوەی کە هەردوو منداڵە تەمەن ساڵ‌و نیووەکەمان مەترسییەکەیان تێپەڕاندووە یاخود نا، (کارینا) قاچی شکاو زیاتر لە مانگێك لە پەنجەی پێیەوە تا سەروی ئەژنۆی لە گەچدا بوو. دوو ڕۆژ وادەی مابوو بۆ ئەوەی گەچەکەی پێی بکەینەوە، لە کوردستان برا گەورەکەم (شەریف کەریم قوربانی) کە بەهۆی نەخۆشی شێرپەنجەوە زیاتر لە ساڵێك بوو لەناو جێدا کەوتبوو، کۆچی دوایی کرد.[11] مردنی براکەم زۆر بە ئازار بوو بۆم، بەتایبەتی بەهۆی ئەوەی چەند مانگێك بوو لێیان دوور بووم‌و من لە ئاوارەیی‌و ئەویش لە ڕۆژگارێکدا کۆچی دوایی کرد کە گومانی ئەوەشی خرایە سەر هەڵگری ڤایرۆسی کۆرۆنا بێت، بەو هۆیەوە نە ڕێوڕەسمی بە خاك سپاردن‌و نە پرسەی بۆ دانرا، کە ئەمەش لەڕووی دەروونییەوە هێندەی تر باری قورسکردم.

بەدرێژایی ئەو ماوەیەش تائێستا بەردەوام دڵم هەر لەلای دایکم بوو کە بە تەنها جێمهێشتبوو، ئەویش لەلایەك خۆی باری تەندروستی خراپ بوو، ئەو هەموو بارودۆخە سەختەش لە جەرگ سوتانییەوە تا دوورکەوتنەوەو دابڕانی ئێمەو زۆر کێشەی تر، خەریك بوون بڕستی لەبەر ببڕن. هەموو ئەمانە پێکەوە بۆ من ڕەخساندنی ژینگەیەك بوو کە تێپەڕاندنیان ئیرادەو تواناو کاتی دەویست. بۆیە ماوەیەکی زۆرم پێویست بوو تا ئاسایی ببمەوەو کاریگەریی ئەو ڕووداوانە لەسەرم

---

[11] - لە ٢٠٢٠/٣/٢٢ لە چەمچەماڵ کۆچی دوایکرد

کەمپێتەوە، بە جۆرێك کە بتوانم دەست بە نوسینەوەی ئەم بەرهەمە بکەم، چونکە خۆشم دەمزانی ئەم کارە لەڕووی دەرونییەوە زۆر زیاتر لەوەی چاوەڕوان دەکرێت، ماندووم دەکات.

جێگەو رێگەی پێویستیشم نەبوو کە بۆ نوسینەوەی کتێبێکی لەم شێوەیە بگونجێت، چونکە هەردوو ئەو کەمپەی لەو ماوەیەدا لێی بووین لە (koln)و (kerpen) جێگەمان زۆر خراپ بوو، ئەگەر هیچ گرفتێکی تریشم نەبوایا، لەو دوو کەمپە دەرفەتی ئەوەم نەدەبوو دەست بە نوسینەوەی بکەم. بەڵام لە ناوەڕاستی مانگی پێنج بەدواوە چووینە کەمپێکی تری پەنامندەیی لە نزیك شاری (bonn)، کەمپەکە لە شێوەی هۆتێل بوو Rheinland – jugendherberge Bonn-(Venusberg) لەوێ ژوری سەربەخۆمان وەرگرت. سەرباری ئەوەی کە دەزانم منداڵ بە ئاسانی دەرفەتی ئەوەم نادەن هەموو رۆژێك بۆ کارکردن لەسەر کتێبەکە کاتێك وەرگرم، بەڵام بڕیارمدا هەرچۆنێك بێت ئەم دەرفەتە لەدەست نەدەم، کە دڵنیا نەبووم لەوەی رۆژانی داهاتووم باشتر دەبن یان رەنگە بۆ من سەختربن لەو رۆژگارانەی تێپەڕیوون. بۆیە بە هەندێ گوشار خستنە سەر کاتی منداڵەکانو خۆشم، لە ژوری (٧٠٩) دەستمکرد بەکارکردن لە سەر کتێبەکەو هەر لەو ژورەش تەواومکرد.

هەرچەندە پلانەکەم وابوو کە بتوانم لە ماوەی پەنجا رۆژێکدا بە تەرخانکردنی رۆژانەی یەك کاتژمێر بتوانم تەواوی بکەم. بەڵام لەکاتی

نوسین‌و دارشتنەوەی کتێبەکەدا پرسیاری ترم بۆ دروست دەبوو، پێویست بوو بە ڕەچاوکردنی کات‌و دەرفەتی ئەم خاتوونەش لە ڕێگەی تەکنەلۆژیاوە ئەو پرسیارو سەرنجانەی هەمبوون بۆی رەوان بکەمەوە، جاری واشبوو پێویست بوو من رۆژێك‌و یان زیاتریش چاوەڕێی وەرگرتنەوەی وەڵامەکان بکەم.

بە تایبەتیش لە کاتی نوسینەوەی ئەو بەشەی کە منداڵەکان لە زیندانی تۆپزاوا لە دایکیان جیا دەکرێنەوە، هەروەها مردنی بەکۆمەڵی منداڵەکان لە سەربازگەی دوبز، لەڕووی دەرونییەوە زۆر تێکچووم‌و چەند شەوێك تا بەیانی دادەنیشتم‌و خەوم لێنەدەکەوت، سەرئێشەو دواتر سیەکانم‌و پاشان تەواوی جەستەم پڕبوون لە ئازار، ئەو کەمپەی لێی بووین بنکەیەکی تەندروستی بچوکی تیابوو، بەڵام لەراستیدا نەمانوێرا پشکنین بکەین لە ترسی ئەوەی نەوەکوو ئاماژەی هەڵگری ڤایرۆسی کۆرۆنابم، چونکە بۆ ماوەی چواردە رۆژ دەبرامە شوێنێکی دابڕاوو چاودێری دەکرام، ئەگەر دۆخی منیش بگەیشتایەتە ئەو حاڵە خێزانم بە تەنها نەیدەتوانی ئاگای لە منداڵەکان بێت کە دووانیان هێشتا پێویستیان بە چاودێری زیاتر هەبوو. بۆیە ئەوەی وەك چارەسەر پێویست بوو لە دەرمانخانەکان بەردەستمانخست‌و بڕیارماندا هەر لەو ژوورەی لێی بووم هەندێك زیاتر خۆم لە منداڵەکان داببڕم‌و ئەگەر دۆخی تەندروستیم زۆر خراپتر بوو ئەوکات پەنا بەرینە بەر نەخۆشخانەکە.

هەندێ چارەسەری رۆژانەم بەکاردەبرد تا ماوەی چواردە رۆژەکە تەواو

بوو، بەڵام هەر ئازاری سییەکانم و گورچیلەو سەرئێشەکە بەرینەدابووم، دوو ڕۆژ لەدوای تێپەڕینی چواردە ڕۆژەکە، پشکنینی کۆرۆنایان بۆ کردم و دەرکەوت هەڵگری ڤایرۆسەکە نەبووم، بەڵام بەگوێرەی پشکنینەکان و تێبینی پزیشکەکان وابوو کە ڕووبەڕووی کێشەیەکی دەرونی سەخت بوومەتەوەو کاریگەریی ئەو بارە دەرونییەیە لەسەرم.

ئێستا کە پێشەکی ئەم کتێبە دەنوسم هێشتا تەواو چاك نەبوومەتەوە، بەڵام بەهیوام تا کتێبەکە چاپ دەکرێت و دەگاتە دەستی خوێنەران، منیش هیچ کێشەیەکی تەندروستیم نەمابێت و خۆم ئامادە بکەم بۆ پرۆژەو کارەکانی ترم، کە ئەگەر خوا تەمەن بدات بە نیازی چەند کاری دیکەم لەسەر جینۆساید.

گەرچی کتێبەکە لەو کات و وادەیەی بۆم دانابوو تەواو نەبوو، بە تایبەتیش بەهۆی ئەوەی کە بە شێوەی پرسیارو وەڵام دامنەڕشتۆتەوە، هەموو پرسیارەکانم لابردوون و وەڵامەکانم لە شێوەی گێڕانەوە ڕێکخستووە، ئەمەش کارەکەی قورسترکردو کاتی زیاتریشی پێویست بوو، بەڵام سەرئەنجام کارەکە بە ئاکام گەیشت و ئەم بەرهەمەی لێ دروستبوو.

هەرچەندە پێشتر بڕیارمدابوو ناوی کتێبەکە بنێم (دوبز دۆزەخی دایکانی ئەنفال)، ساڵی پار دوای ئەنجامدانی دیدارەکە لە لاپەڕەی تایبەتی خۆشم لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوك بڵاومکردبووەوە کە ئەم دیدارە لەژێر ئەو ناونیشانەدا دەکەم بە کتێبێك. بەڵام کۆمێنتی هاوڕێیەکی خۆشەویستم کاك نەسرەدین کە خەڵکی دوبزەو لە وڵاتی سوید نیشتەجێیە، سەرنجی ڕاکێشام بۆ ئەوەی ناوی کتێبەکە بگۆڕم. چونکە لە کۆمێنتەکەیدا ئەوەی

خستبووه روو كه شارهكهى ئهو (دوبز) خزمهتى گهورهيان به قوربانيانى ئهنفال كردووهو بهداخێكى زۆرهوه ئهوهى دهربرِيبوو كه بۆ لهمهودا ناوى شارهكهى وهك دۆزهخى ئهنفال وێنا دهكرێت. لهراستيدا خۆشم ئهوهم دهزانى كه خهڵكى دوبز چيانكردووه له هاوكاريكردن‌و بهتايبهتى له ناشتنى تهرمى منداڵه ئهنفالكراوهكاندا.

دواى روخانى سهداميش بۆ دووهم رۆژ خۆم چووبومه دوبز بۆ ماڵى (مام ئهحمهد موختار)[١٢] كه لهناو ژنانى ئهنفالكراودا وهك پياوچاكێك ناوى دههات. ههرچهنده ئهوكاتهى من چوومه ماڵيان ئهو چهند ساڵێك بوو له ژياندا نهمابوو، بهڵام خێزانهكهى كه لهسهروبهندى مردنى منداڵهكانى ناو سهربازگهى دوبز، يارمهتى هاوسهرهكهى دابوو له شۆردن‌و كفنكردن‌و ناشتنى تهرمى منداڵهكان، هاوكارى ئێمهشيكرد له پێدانى زانيارى‌و دهستنيشانكردن‌و دۆزينهوهى شوێنى ناشتنيان و ژمارهى منداڵه مردووهكان. بۆيه به رهچاوكردنى بارى دهرونى خهڵكى دوبز و وهك رێزێكيش لهو سهرنجهى كاك نهسرهدين، بريارمدا ناوى كتێبهكهش بگۆرِم‌و ئهمهم پێپهسهندتر بوو (نێرگز، له دۆزهخى ئهنفالدا). ههروهها بۆ رێزگرتن له مام ئهحمهدو خانهواده بهرِێزهكهى كه لهو رۆژگاره سهختهى ئهنفال‌و له ماوهى ئهو شهش بۆ حهوت مانگهى مانهوهى ژن‌و منداڵهكانى ئهنفال له

---

[١٢] - موختارى دوبز بووه ئهوكاتانهى ژن و منداڵه ئهنفالكراوهكان لهسهربازگهى دوبز دهستبهسهر كراوون، بههۆى بلاوبونهوهى نهخۆشى لهناو منداڵهكان، رێژهيهكى زۆر منداڵ مردون و سهربازهكان تهرمهكانيان فرێداوهته دهرهوهى سهربازگهكه، مام ئهحمهد ههموو تهرمهكانى له چهند شوێنێكى تايبهت بهخاك سپاردووه.

سەربازگەی دوبز، تەرمی هەموو ئەو منداڵانەی ناشتووە کە لەناو زیندان مردوون‌و بە (٢٧٤) منداڵ مەزەندە دەکرێت[١٣]، بڕیارمدا کتێبەکەش بۆ ئەو بکەمە دیاری‌و ئاسودەیی بۆ رۆحی بخوازم.

ئەگەر گەورەیی ئەو کارەی مام ئەحمەد نەبوایا دەبوو کتێبەکە بکەمە دیاری بۆ هاوسەرەکەم‌و منداڵەکانم، چونکە لەکاتێکدا دەستم بەم کارە کرد ئەوان لە هەمووکات زیاتر پێویستیان بە من هەبوو، بەزەوتکردنی کاتی ئەوان، کارەکەم تەواو کرد. هیچ نەبێت لێرەوە دەمەوێ سوپاسیان بکەم تا کە گەورە بوون‌و ئەگەر کەمتەرخەمییەکی ئەم رۆژگارانەی باوکیان لە یادەوەرییاندا تۆمارکرابوو، تێبگەن کەمتەرخەمیەکەم‌و فەرامۆشکردنی ئەوان بۆ ئەم کارە گرنگە بووە.

سەبارەت بە ناوەڕۆکی کتێبەکەش جێی دەهێڵم بۆ خوێنەران‌و نامەوێ هیچی لەبارەوە بڵێم، تەنها ئەوە نەبێت کە بڵێم ئەم کتێبە دیداری کەسێکە، بەڵام لەڕاستیدا چیرۆک‌و سەربوردەی دەیان ژنی ئەنفالکراوی گەرمیان‌و کوێستانی نیشتمانەکەمە، ئازارو مەینەتی رۆژگاری ئەنفال‌و چەوساندنەوەی ناو زیندان‌و خەم‌و پەژارەو ستەمی رۆژگاری دوای ئەنفالیشە، هەوڵمداوە لە نوسین‌و داڕشتنەوەیدا تۆی خوێنەر بۆ چەند کاتژمێرێك بکەم بە کەسێکی ئەنفالکراو، وا هەست بکەیت ئەوە تۆیت ئەوە خێزان‌و منداڵ‌و کەسوکاری تۆن دەستگیرکراوون‌و خراونەتە زیندانەوە،

---

[١٣] - چاوپێکەوتنی نوسەر لەگەڵ رەحیمە بەهادین خێزانی مام ئەحمەد موختار، لە ٢٠٠٣/٤/١١، هەروەها بەپێی ئەو زانیاریانەی لە ئەنجامی چاوپێکەوتنی نوسەر لەگەڵ شایەتحاڵەکانی ئەنفال ئەنجامیداون و زانیاری (ئەبو ئەیمەن) یەکێك لە سەرپەرشتیارانی سەربازگەی دوبز لە ٢٠٠٣/٦/٤

هەست بە ترسو تێنوێتیو برسێتی دەکەیت، هەست دەکەیت چیرۆکی ژیانی خۆتەو ئەوە تۆی سەرگوزشتەکە دەگێڕیتەوە.

بۆیە داواکارم کە ویستت ئەم کتێبە بخوێنیتەوە ئەو کاتەی دەستی بۆ دەبەیت رەچاوی ئەوە بکە کاتی پێویستت لە بەردەست بێت، چونکە دڵنیام یەکجار دەیگریتە دەستتەوەو چاو لەسەر لاپەڕەکانی هەڵناگریت تا نەگەیتە کۆتایی، کە تەواویش بوویت چەندین پرسیاری بێوەڵامت لا دروست دەبێتو ئازارێکی زۆر دەچێژیت. بۆیە من لە ئێستاوەو پێشوەختە داوای لێبوردنت لێدەکەم، چونکە دەزانم خوێندنەوەی ئازار بەخشە، رەنگە لەڕووی دەروونییەوە ماندووتان بکاتو بۆ ماوەیەکی دواتریش هەر ببێتە مایەی ئازار بۆتان، بەڵام ئەمەش بەشێکی مێژووی میللەتەکەمانە، پێویستە بۆ ئێستاو بۆ نەوەکانی داهاتوومانی بگێڕینەوە.

هەروەك ئومێدی ئەوەش دەخوازم ئەم کارەی ئێستاو ئەو بەرهەمانەی پێشووتر نوسیوومن، ئەگەر خوا تەمەنی تری داین ئەوانەشی لە داهاتوو دەیاننوسم، خزمەتێك بە مێژووی نەتەوەکەم بکاتو بۆ منیش بە عیبادەتێکی بچوکی میللەتو نیشتمانەکەم ئەژمار بکرێت.

**عارف قوربانی**

**٢٠٢٠/٨/٥**

**ڤینۆسبێرگ – بۆن – ئەڵمانیا**



نێرگز عەزیز بابا

لە دەفتەر نفوسەکەم ناوم نێرگزە، بەڵام کەس بەو ناوەوە من ناناسێت. هەتا نەڵێی هەرمێ کەس نازانێ من ئەڵێن. ئەوە وا بۆ بیست و پێنج ساڵ ئەچێت لێرەین لەم خانووەو هەر لەم گەڕەکە، برۆ لە دەرو دراوسێو لە خزمەکانیشم پرسیار بکە بڵێ ماڵی نێرگز کامەیە؟ پێت دەڵێن کەسێك بەو ناوە لە گەڕەکەکەمان نیە. یان دەڵێن وەڵا نێرگز ناو ناناسین.

تەنانەت ئەگەر بچێتە گوندەکەشمان ئەوەی لێی لەدایکبووم‌و تیایا گەورە بووم‌و ئەو گوندەش کە شوومکردو لێی ژیاووم تا دێ ڕمیان‌و ئەنفال، لە نێرگز ناو بپرسیت پێت دەڵێن لە ئاوایی ئێمە کەس ناوی نێرگز نەبووە. بەڵام بڵێی هەرمێ ئیتر هەموویان دەزانن من دەڵێیت. ئەویش بەهۆی ئەوەوە بووە ئەوکاتەی من لەدایکبوومە وەك ئێستا نەبووە خەڵك یەکسەر بچێت ناوی لێبنات‌و ناسنامەی بۆ دەربکات، بەخوا خەڵك هەبوو لە دێیەکەمان ریش‌و سمێڵی دەرکردبوو هێشتا ناسنامەی نەبوو، وەك ئەوەی هەر لەدایك نەبووبێت لای حکومەت ناوی نەبوو. ژن‌و مێردیش هەر لای مەلا مارەیان ئەبڕا، خەڵك ناچوو عولام دەرکات. بۆیە هەندێجار ئەوەیش دەبووە کێشە حکومەت ناسنامەی بۆ منداڵ دەرنەئەکرد چونکە لای حکومەت دایك‌و باوکی ژن‌و مێرد نەبوون.

من ئەو کاتەی کە لەدایکبووم دوو ساڵ دوای ئەوە ناونوس هاتوونەتە گوندەکەمان لە سۆران[14] نازانم بۆچی ناو خەڵکەکەیان گشت کە ناوی خێزانەکەی ئێمەیان نوسیووە من لە هەموویان بچوکتر بووم ئەوکاتە، وتوویانە ئەمە گوڵە جوانە ناوی چیە؟ دایکم وتوویەتی نێرگز، ئەوانیش بەناوی نێرگزەوە منیان ناونویس کردووە. بەڵام وەکتر بە ناوی نێرگزەوە بانگی منیان نەکردووە، مامەیەکم هەر لەو کاتەوەی من لەدایکبووم پێمی وتووە هەرمێ، هەتا مردیش هەر پێمی ئەووت هەرمێ گوڵ، ئیتر هەموو کەسوکارو خزمو خوێشو خەڵك ئاوایش هەر بەزمانی مامەوە بە هەرمێ بانگمیان کردووە. کە گەورەش بوومو شومکردو ئەو وەزعانەمان بەسەرهاتو مامانیم دەکرد لای هەموو کەس ناوەکەم بەوە بڵاوبووبوویەوە هەرمێ مامان.

کە من لەدایکبوومە وابزانم دوو ساڵ دوای ئەوە ئیحسا کراوە. کە گەورە بوو بووم ئیتر ئینسان لە حاڵو منالی خۆیو تەمەنی خۆی لە دایكو باوکی دەپرسێت، کە دەمپرسی دەیانووت کە ئیحساکەی پەنجاو حەوت کرا تۆ دوو ساڵان بوویت، بەو هۆیەوە ساڵی لەدایکبوونەکەی منیان وەك خۆی دەزانی. ماڵ ئێمە دایكو باوکم منالیان زۆر بووە سیان چوارێکی هەر بە منالی مردووە، ئەوانەی مابووینەوە پێنج خوشكو پێنج برا بووین. کاکەم ساڵەح برا گەورەمان بوو ئەوە نۆبەرەی دایكو باوکم

---

١٤- سۆران گوندێکە ١١کم دەکەوێتە باشوری رۆژهەڵاتی شارۆچکەی تەکیێ جەبارییەوە

١٥- مەبەستی لە سەرژمێری گشتی دانیشتوانی عیراقە لە ساڵی ١٩٥٧

بووه. دوای ئەو خوشکێکم بووه سەلمەی ناو بووی. ئینجا حەمەدەمین برامو دوای ئەویش برایە ترم بوویە غازی، وەلاّ دوای غازی عەلی–ش بوویە، ئینجا کچێکی تریان بوویە ناوی شوشە بووی، بەدوای شوشەدا من لەدایکبوویمە. سیان تریشمان لەدوای منەوە هەبووە. زەینەبو عەسلّیو نوری. تەواوە ئێستا ئەوە ئەکاتە پێنج خوشکو پێنج برا؟

تا ئەنفالەکە ئەوەنە خوشکو برا هەموومان لە ژیاندابووین، گشتی چووبووە سەر جێوڕێی خۆی. براکانم ژنیان هێنابوو، خوشکەکانم شویان کردبوو، تەینا عەسلّی خوشکم لەسەر مالّ مابووەوە. بچۆ دێی سۆران بان جەباری[16] پرسیار بکە مالّ عەزیز بابا، خەلّك گشتی مالّ باوکم ئەناسن. مالّ دایکیشم خەلّك ئاوایی (عەلی مستەفا)[17] بوون بلێی (سەبری عەلی) ئەیناسن، بەخوا دایکم ئەوەنە ژنێ چاك بوو خەلّك بەعەزرەتەوە بوون بۆی.

دێیەکەمان ئەوکاتە ١٥ مالێك ئەبووین هەموو ئاشناو هاوسێو دۆستی یەکتری بووین، زۆربەیشمان هەر خزمو بەرەبابێك بووین. هەرچەندە کارەبامان نەبوو، رادیۆ نەبوو، تەلەفزیۆن نەبوو، بەلاّم کەیفو سەفای ژیانی ئاوایی، یاری لەگەلّ کچانو شەوانیش دانیشتن بەدیار چیرۆکی داپیرەکانمانەوە، لە هەوالّی ناخۆشو درۆی ئەم تەلەفیزیۆنانە باشتر

---

[16] - ناوچەی جەباری (بان جەباری) دەکەوێتە ناوەندی سێگۆشەی چەمچەمالّ، قەرەنجیر، قادرکەرەمەوە. لە یەکەیەکی ئیداری ناحییەو ٣٣ گوند پێکهاتووە.

[17] - عەلی مستەفا، گوندێکە دەکەوێتە باکوری جۆرئاوای ناحییەی قادرکەرەم.

بوو. پیرەژنێ لە هەر ماڵێك هەبوایا بە حەكایەتو سەربوردەی رابردوو ئەوەنە خۆشی پێدەبەخشین بە هەزار ژیانی شارمان نەئەدا. شەوانی زستان لەبەر فتیلە یان چرایەكو لەبەردەم سۆپایەكی داردا هەموو خێزانەكە كۆدەبووینەوە، ئەزانی چەنێ خۆش بوو. یەكێ بەسەرهاتی دەگێڕایەوە یەكێ مەتەڵی دەووت، كوڕەل ئاوایی لەماڵێكا كۆدەبوونەوە خەریكی كلاوێنو یاریو بەزم بوون تا نیوە شەو. كچەكانیش لە ماڵەخزمێكا گرد دەبووینەوە ئەتووت سەیرانە. نیووە شەو بەدەم حەكایەتەوە چاییو دۆینەیەكمان ئەخوارد هەزار خواردنی ئێستای ئەهێنا.

هەرچەند ژیان لە لادێ هەمووی هیلاكیو ماندوێتییە، كە منالیش بووین هەر ئیشیان پێمان دەكرد. من خۆم ناسیووەتەوە یان لای كارو بەرخ بووم یان لە ماڵەوە یارمەتی دایكمو خوشكەكانم دەدا. یان دەچوین لەگەڵ زەلامەكان بۆ بەردەستییان لە درەوكردنو زەرعاتو مەڕدارییی، شان بەشانی پیاوەكان هەموو ئیشێكمان دەكرد. كە شەوانی هاوین دادەهات لەبان خانووەكە دەخەوتین ئەو ئاسمانە سافو جوانەی جاران ئێستا نەماوە، سەدام ئەوەنە تۆپو تەیارەی تەقاند جوانی ئاسمانیشی نەهێشت. تا چاومان دەچووە خەو یارییمان لەگەڵ جریووەی ئەستێرەكان دەكرد، ئەستێرەمان ئەژمارد، هەریەكەو ئەستێرەیەكمان كردبووە هی خۆمانو بەشوێنیا دەگەڕاین، جاری وابوو بەپێی مانگو وەرزەكان شوێنیان دەگۆڕا، لێك نزیك دەبوونەوە، دەچوونە نزیكی

مانگ، لەیەك دوور دەكەوتنەوە. خۆمان لێدەبووە ئەو ئەستێرانە، ماندوێتی رۆژمان بەو جۆرە دەردەچوو. ئێستا كوا نە مانگو نە ئەستێرەو نە ئاسمانیش وەك جاران جوان نین، هیچیان نادرەوشێنەوە.
بەخوا ماڵێك قوركاریی بكردایا سەرسواقی بكردایا، مەڕی ببڕیایەتەوە، زەرعاتی بڕنیایا، یان ساوەریان بكوڵانایا، دۆینەیان بكردایا، هەر ئیشێكی بوایا ژنو پیاو ئاوایی بە هەروەزیی هەركەسە وەك ئەوەی بۆ ماڵەكەی خۆی بێت ئەیانكرد. ئەوكاتانە لە خوشكو برا زیاتر بەكەڵك یەكتری دەهاتین. ئیستا كەس هەقی بەسەر كەسەوە نییە، هاوسێتی كوا ماوە.
دێیەكەیشمان چوونكە ئاوی هەبوو ئیتر خەڵكەكە لەگەڵ مەڕداریو دەغڵو دان، زەرعاتیشمان ئەكرد، پیاز، مەرەزە، تەماتەو بامێ، پاقلە، سەوزە، ئیتر ساڵ دوانزەی مانگ ئێمە ئیسراحەتمان نەبوو. هیلاك بووین ئەوسا وەك ئێستا تەرەكتەرو ئەم شتانەی تر نەبوو، فەلاحەتو مەڕدارییو زەرعات زۆر قورس بوو، بەڵام چونكە خەڵك ئاواییەكە یارمەتی یەكتریمان ئەدا لەچاو شارو ژیانی ئێستامانەوە وەك سەیران وابوو. ئەگەر ئەو ئەنفالەمان بەسەرا ناهات[18] بەخوا لادێ هەزار ئەم ژیانەی ئەهێنا، بەڵام تازە ئەڵێی چی، ئەچیتەوە ئاواییەكانیش هەر

---

[18] - ئەنفال ناوی ئەو كردە سەربازییە بوو كە لە شوبات بۆ ئەیلولی ١٩٨٨ لەلایەن حكومەتی عیراقەوە بەرانبەر بە كورد ئەنجامدرا، ٤٥٠٠ گوند وێران كران و ١٨٢٠٠٠ كەس بەرپەلاماری سەربازی كەوتن.

خەمو خەفەتی یادگاری کەسوکارەکەت ئەتکوژێ. هەر گوێ چەمێ، تاشەبەردێ، هەر بستێ زەویی ئەو خوایە ئەبینی بەسەرهاتی خوشکو برایەکتو کەسوکارەکەتی پێوەیە، چونکە بەو شێوەیە ڕۆیشتوونو ساڵانێکی زۆریش هەر چاوەڕێ بووین بێنەوە، بۆیە هەر شتێك ئەبینی هی ئەو سەردەمە ئیتر بەدەست خۆت نییە هەموو ئەو ڕۆژگارانە دێنەوە بەرچاوت. ئێستا کورد ئەڵێ کە یەکێ مرد هەر شەوی کێوێ ئەکەوێتە نێوانتانەوە، بەخوا ئەوە بۆ ئەنفالەکان هیچ ڕاست نییە. ئەوەتا من ئێستا قسە بۆ تۆ ئەکەم ئەوە نزیك چەند ساڵە، سیو ئەوەنە ساڵە، ئەوەتا ئەمبینی خۆم پێڕاناگیرێت. وا ئەزانم ئەمڕۆیە. هەموو ڕۆژێ جارێ دووان هەر دێنەوە بەرچاومان. بۆیە ئەچینەوە بۆ ئاوایی ئەوەنەی تر عەزاب ئەچێژیت، هەر نەچیتەوە بۆ ئاوایی باشترە.

من ئێستا ئەچمە (سۆران) منداڵیو هەتا گەنجیم لەوێ بوو، خەمو خەفەتی دنیا ئەخۆم، بەدەست خۆم نیە خوا ئاگادارە ئەڵێی ئەم فیلمی تەلەفیزۆنو شتەیە هەمووی دێتەوە بەرچاوم. دایکم باوکم خوشکو براکانم، خزمو کەسوکار، کچەکانی هاوڕێی سەردەمی گەنجێتیم، زیلە عەسکەرییەکان کە هاتن براکانمو باوك منداڵەکانو زەلامەکانیان برد. جاشەکان[19] قەوم خۆمان، عەسکەرییەکان، دارو بەردی خانوو ماڵ،

---

[19] -جاش دەستەواژەیەکە بۆ ئەو چەکدارە کوردانە بەکار براوە کە لەگەڵ دەسەڵاتی دەوڵەتەکان بوون دژی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد. لە کوردستانی عیراق لەگەڵ هاتنی بەریتانیا ئەم دیاردەیە سەریهەڵداوە، بەڵام بەشێوەی ڕێکخراو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شەستەکانی سەدەی بیستەم.

هەمووی هەر بەپێش چاوما دێتو دەچێت. ئەچمە (مامشە)[20] ئیتر ژیانی ژنو مێردایەتیو مەینەتی منداڵو دێ رمیانو هەمووی هەر لەبەرچاوتە، تازە ئێمە ئەم جیلە دەبێت بە مەراقو مەینەتیی ئەنفالەوە بمرین.

من منداڵ بووم ژن بەژنم پێکراوە بۆ برایەکم بۆ حەمەدەمین ئەها وتم لە ساڵەحو سەلمە منداڵتر بوو. لەگەڵ ماڵێك هەر خزمایەتیان هەبوو لەگەڵ خۆمان ئەوان لە (مامشە) دائەنیشتن، ماڵ ئەحمەد حەسەنیان پێیان ئەووت. بە ئەسڵ خەڵکی ئاوایی (شێخ محمد)[21] بوون، دوو برابوونە دایكو باوکیان زوو مردبوونو لەماڵ مامەیان گەورە بوو بوون، دوای چووبونە مامشەو لەوێ ژنیان هێنابوو کۆمەڵێك نەوەیان لێکەوتبووەوە، ئێمە لەگەڵ ماڵ ئەوان ژن بەژنمان کردووە (گەورە بە بچوك). من لە تۆڵەی (ناهیدە) دراوم.

ئەوکاتە ژن بە ژن بە دوو شێوە هەبوو ئەگەر هەردولا کچو کوڕەکانیان کاتی ژن هێنان و شوکردنیان بوایا ژن بە ژنیان پێئەکراو هەردولا ئەیانگواستەوە. بەڵام ئەگەر لایەکیان کچ عازەویان نەبوایا یان کوڕی جاحێڵیان نەبوایا ژن بە ژن گەورە بە بچوکیان ئەکرد. کچێکی منداڵیان لە کوڕێ منداڵی ماڵەکەی تر مارە ئەکردو کە گەورە ئەبوون ئەیگوێزایەوە. ئەوەی ماڵ ئێمە وابوو ئەوان تەرەف ماڵ مێردەکەم

---

٢٠ - مامشە گوندێکی حەفتا ماڵی بووە، دەکەوێتە باشوری رۆژهەڵاتی شارۆچکەی لەیلان سەر بە پارێزگای کەرکوك.

٢١ -شیخ محمدی خوارو سەرو، دوو گوندی هاوسنوری گوندی سۆرانن سەر بە تەکیێ جەباری.

کچێکیان داوەتە حەمەدەمینی برامو منیان لە محەمەد ئەوان مارە کردووە. بەڵام محەمەد منداڵ بوو دوو ساڵ ئەگەر سێ ساڵ لە منیش منداڵتر بوو، ئێمەیان لەیەکتر مارە کردووە بە منداڵی. بەڵام حەمەدەمینی برام چاوەڕێی ئەوەی نەکردووە تا ئێمە گەورە ئەبین، ئەو ژن خۆی گواستۆتەوە. کە منیان گواستەوەو لەتۆڵەی ژنی ئەو درابووم، ئەو دوو منداڵیان هەبوو. عومرم تازە گەیشتبووە پانزە ساڵ بە بوکی بردمیان، محەمەدیش دوانزە ئەگەر چوو بووە ناو سیانزە ساڵانەوە. ئەو کاتەی لەیەك مارە کراین من چووبومە دە ساڵەوەو ئەویش حەوت هەشت ساڵێك ئەبوو. وائەزانم ئێستایا ئەوکات سەیارە ئەوەنە زۆر نەبوو، بە جێبێ بیچکە لە سۆرانەوە بۆ مامشە بە بوکی بردمیان، یەکەمجارم بوو لە ناوەوە سوار سەیارە ئەبووم. پێشتر جارێ دووان کە منداڵ بووم لەگەڵ دایكو باوکم بە سەیارە چوویبووین بۆ کەرکوك، بەڵام ئەو سەیارەیەیە دوا بەتاڵ بوو ئێمە لە دواوە سوار ئەبووینو سەری بەتاك بوو، ئەموت خوایە ئەبێ ناوەوەی سەیارەکە چۆن بێت، ئەبێ رۆژێك قسمەت بێ منیش لە ناوەوەی سەیارە سەرکەوم. خۆ ئەو سەیارەیەیش هی ئاوایییەکەی خۆمان نەبوو ئەویش لە (تەکیێ)[22] وە ئەهات، ئەگەر

[22] - تەکیێی جەباری دەکەوێتە ٢٥کم باشوری خۆرئاوای ناوەندی قەزای چەمچەماڵەوە، لە ٢٠٠٤/٤/٢٤ کراوەتە یەکەیەکی ئیداریی (ناحییە) لە ناوچەی جەباری و ٢٣ گوندی لەسەرە. لەڕووی ئیدارییەوە سەر بە قەزای چەمچەماڵە.

ئەخۆشێ هەبوایا بیانبردایا بۆ دکتۆر بۆ (شار)[23] یان ئەشیای ببردایا بۆ بازاڕ ئەو سەیارەیە لە تەکێوە ئەهاتە ئاوایی.

خوا کردی‌و قسمەتەکەم وابوو کە بە بوکی بردمیان لە ناوەوەی سەیارە سوار بووم. ئیتر ئەوکاتە عادەت وابوو چەند رۆژێ هەڵپەڕکێ‌و شایی گەرم بوو. مامشە نزیك بوو لە کەرکوك‌و لەیلانەوە، لەوێ دهۆڵژەن هەبوو لای (تاوغ)[24]، هاوردبوویان دوو شەوو دوو رۆژ لەو حەوشەیە دۆڵ‌و زوڕنایان کوتاوە.

لەوێش لە مامشە هەروەك ئاوایی خۆمان خەریك کشتوکاڵ کردن‌و مەڕداری بووین، بەڵام ئەوێ نزیك بوو لە کەرکوکەوە ئیتر هاتووچۆمان بۆ شار زۆر بوو، ماڵ عەزیز برای محەمەد مێردم لە کەرکوك لە گەڕەکی سەرکارێز بوون، مامەڵەو بازاڕیی‌و پێویستی و شتمان هەمووی لە کەرکوك بوو لەبەرئەوە زۆر ئەچووین. بۆ من لەچاو گوندەکەی خۆمانەوە ئێرە خۆشتر بوو. کارەبایان هەبوو، سەیارە هەبوو لە دێیەکە، حساوکە نسبەتەو شارێك بوو. هەرچەندە حساوکە منیش هێشتا هەر منداڵێك بووم درابووم بەشوو، ماڵداریی‌و بەخێوکردنی خێزان ئەرکی قورس بوو، بەڵام چونکە هەر خۆم ناسیووەتەوە لەماڵ باوکم یارمەتی دایك‌و خوشکانم دابوو، بۆیە هەموو ئیشێکی ماڵ‌و دەریشم

---

[23] - شار ئاماژە بووە بۆ ناوی پارێزگای کەرکوك.

٢٤ - داقوق شارۆچکەیەکی زۆرینە تورکمان نشینی باشوری کوردستانە، ٤٠کم لەناوەندی شاری کەرکوکەوە بەرەو باشور دوورە، لە هەندێ ناوچە بە تاوغ ناودەبرێت.

ئەزانی، بەدەم خۆیشم نەبێ بچۆ لە خەڵك هەردوو ئاوابییەکە لە سۆران‌و لە مامشەیش بپرسە بزانە چەند گورج‌و گۆڵ‌و ئازا بووم، بەخوا ئیش دەرو ماڵم ئەکرد.

ئەو چەند ساڵەیش کە تازە شوومکردبوو پێشمەرگە و حکومەت خەریکبوو رێکدەکەوتن، پێشمەرگە کەوتبوونەوە هاموشۆی شارو خەڵك کەمێك کەوتبووە ئیسراحەتەوەو ترسەکە نەمابوو، ژیان خۆش بوو. چونکە پێشتر ناڕەحەتیمان زۆر چەشت بەهۆی شەڕو تۆپ‌و تەیارەوە، بەخوا بیرمە هەروا حەوت هەشت ساڵێك ئەبووم شتێ پەیا بوو (حەرەس قەومی)[25] بوو ناوی ئاوا بوو ئەها ئێستایش هەر پێی ئەڵێین ساڵێ بەعسییەکە[26]. پەلامار دێیەکانیان ئەدا مەڕوماڵاتیان بەتاڵان ئەبرد، ماڵ‌و حاڵمانیان ئەسوتان، لەو کەل (قەرەوەیس)[27]ەوە تۆپیان ئەنایا ئاوابییەکەی ئێمەوە، قایمەو دەغڵ‌و دانمان هەمووی سوتا، رەنج ئەو ساڵەمان بەباچوو، خانوو ماڵیشمانیان ئاور تێبەردا.

---

[25] - هێزێکی میلیشیای چەکدار بوو لە ساڵی ١٩٦٣ دوای کودەتای بەعسیەکان و گرتنە دەستی دەسەڵات، ئەم میلیشیایەیان دروستکرد وەك هێزێك بۆ سەرکوتی نەیارەکانیان.

[26] - ساڵی ١٩٦٣ دوای کودەتای بەعس و هاتنە سەر حوکم، بەهۆی ئەوەی لەو چەند مانگەی حوکمڕانیکردنیان زنجیرەیەك پەلامار بۆ سەر گوندەکانی ناوچەی کەرکوك دەستپێکرد لە یادەوەرەی کورددا ئەو ساڵە بە ساڵی بەعسییەکە تۆمار کراوە.

[27] - کەل قەرەوەیس دەکەوێتە باشوری خۆرئاوای چەمچەماڵەوە، بەرزاییەکە لە نێوان مەقان و تەکێی جەباری، دەڕوانێتە سەر ناوچەکەیا، ساڵی ١٩٦٣ حەرەس قەومیەکان لەو بەرزاییەوە تۆپبارانی گوندەکانی ناوچەی جەبارییان کردووە.

ماڵ غەزوریشم ئەوکاتە هێشتا ئەو ژن و ژنخوازییە لە نێوانمان نەبوو بەڵام چوونکە هەر قەوم بووین ئەوانیش مامشە سوتابوو هاتبوونە ماڵ ئێمە. ئەوان چونکە لە کەرکوکەوە نزیك بوون تاڵانچییە عارەبەکان زووتر چووبونە سەر گوندەکەو تاڵانیان کردبوو. ئەیانووت پێنج شەش زەلام ئاوایش لەو کەڵوەزانە خۆیان شاردبووەوە کەوتبوونە دەست عەسکەرو حەرەس قەومییەکان، خەڵك ئاوایی کاتێ پێیان زانیبوو کە چووبونە شوێنەکە سەیر ئەکەن هەموویانیان کوشتبوو[28]. ژنەکان تا ئەم ساڵانەی دوایش هەر ئەیانگێڕایەوە. ئەیانووت زەلامێ خەڵك کەرکوکیش لەگەڵ دایکەکەیا لەترس حەرەس قەومی شاری جێهێشتووەو پەنای داوەتە لای ئەمان لە مامشە، کە حەرەس قەومیەکان گەیشتونەتە مامشە نازانم کابرایان ناسیووە چی، یان بەشوێنیا گەڕاوون، زەلامەکەیان بینیووەو گرتوویانەو بە بەرچاو ژن و منداڵ ئاواییەوە کەوتوونەتە سەرو گوێلاکی، ئەیانووت دایکەکەی خەریکبوو ئاگر لە جەرگی بەر دەبوو، چەنێ کەوتۆتە مل دەس و پای عارەبەکانا تا بیدەنەوە، بەڵام هەر بردویانەو دایکەکەشی بەشین و واوەیلا شوێنیان

---

٢٨ - چارپێکەوتنی نووسەر لە ساڵی ٢٠٠٢ لەگەڵ نازدار محمد عەلی لە دایکبووی ساڵی ١٩٥٠ مامشە، بەپێی زانیارییەکانی ئەم شایەتحاڵە هەریەك لە (عەزیز حاجی رەسوڵ- عەول حاجی رەسوڵ- حەمەی ساڵح - بەکر رەحیم - حسێن حەمادی- عەبدوڵلا) لەلایەن حەرەس قەومیەکانەوە کوژراون.

کەوتووە. هەر لەولای مامشەوە لای لەیلان[29] کابرایان کوشتووەو جەنازەکەیان خستۆتە بەردەست دایکەکەی. بەخوا ئەیانووت هەتا ئەو خەڵکە گەیشتونەتە ئەوێ ئەو دایکەی خەریکبووە بەدیار ئەو جەنازەیەوە خۆی کەوڵ بکات ئەوەنە خۆی رنی بوو. ئیتر خەڵك مامشەو ئەو دێیانەی دەوروبەری زۆر ترسابوون. کە ئەو ماڵە خزمە لە مامشەوە هاتبوونە سۆران ئەم قسانەیان بۆ ماڵ باوکمو خەڵك ئاوایی گێڕابووەوە، وەك ئەوەی ئەم کوشتنانەیان لە دێیەکەی ئێمە کردبێ هەموو تەعزێبار بووین بۆیانو ئەوەنە ترسابووین کە حەرەس قەومی هاتە ئەو دێیانەی تری ناوچەکەمان هێشتا هەر لە کەل قەرەوەیس بوو ئێمە هەموو لە ترسا ئاواییمان چۆڵکرد.

جاران کوشتار وەك ئێستا نەبوو یەکێ بکوژرایا تا چەند ساڵێك هەر قسەوباسی ناو خەڵك بوو. کە منیش شوومکردە محەمەد لە مامشە بەخوا وابزانم شەش ئەگەر بۆ حەوت ساڵێك بەسەر حەرەس قەومیا تێپەڕیبوو بەڵام بڕوا بکە ئەتەوت دوێنێ روویداوە، هەر لەناو خەڵکەکە باس دەکرایەوە. ئەو کوشتارەی لە (مامشە)ش کرابوو بە هەموو ناوچەکەیا دەنگی دابووەوە. ئیتر ئەو حەرەس قەومیانە روویان دەکردە هەر شوێنێ ئەو مەنتیقەیە لە ترسا چۆڵی دەکرد.

---

٢٩ - لەیلان ناوەندی ناحییەی قەرەحەسەنە ١٩کم دەکەوێتە باشوری رۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە.

هەرچەندە ئەوکاتە پێشمەرگەیش پەیا بوو بوون، بەڵام کەم بوون‌و نەیانئەتوانی بەر بەو لێشاوەی جەیش‌و حەرەس قەومییەکان بگرن، تەیارەیەش تازە پەیا بوو بوو بە ئاسماندا دەسوڕایەوەو لە هەندێ شوێن رەمییان کردبوو، بۆیە خەڵك جگە لە خۆشاردنەوەو راکردن هیچ چارەیەکی تری نەبوو. ئەوانیش لەوە ئەچوو حکومەت پێیانی وتبێت بڕۆنە سەر ماڵ کورد و هەرچیتان دەستکەوت حەڵاڵتانبێ بیەن بۆ خۆتان، بۆیە هەروا (وەلەکە عارەب)[30] حەویجە[31] و ئەو خوارە گشتی بە دزداشەو عەگالّ[32] و تفەنگەوە هاتبوون‌و بەر بووبوونە گیان ئەو میللەتە. لای ئێمەیش لە (سۆران) رۆژێك لەو کەلۆەزو هەردانە خۆمان شاردەوە تا (عارەبەکان) تالآنی خۆیان کرد هەرچی زەخیرەیەك بۆ خواردن بشێ بە عەمار گەنم‌و جۆو ئالیکی ئاژەڵەکانیشەوە هەموویان بردبوو، ئاگریان نابووە خانووەکانمانەوەو چوونەوە، هەر چۆنێك بێت باش بوو کەس لای ئێمە نەکوژرا. ئیتر هەر کەس هاتەوە سەر ماڵ‌و حاڵی خۆی‌و کەوتینەوە چاککردنی خانوو ماڵ‌و گەلەخانەکانمان. دوای ئەوەش هەتا من شووم کرد زۆرجار ئەو ترسە هەر هەبوو، پێشمەرگە دایەمە ئەهاتن‌و بەناوچەکەیا ئەگەڕان، حکومەتیش بەشوێنیان ئەکەوت.

---

[30] - وەلەکە عارەب دەستەواژەیەك بووە لەناو کورددا بۆ ئەو چەکدارە عەرەبانە بەکاربراوە کە لە ریزەکانی حەرەس قەومی بوون‌و ساڵی ١٩٦٣ گوندەکانی کوردیان تالآن (فەرهود)کردووە.

[31] - حەویجە ناونەندی قەزایەکی عەرەبنشینە لە باشوری کوردستان ٥٢کم دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای شاری کەرکوکەوە، پێنج سەت هەزار عەرەبی تیا نیشتەجێیە.

٣٢ - جل و بەرگی میللی عەرەبە.

وابزانم بەین خۆشیان ماوەیەك تەواو نەبوو پێشمەرگە بوو بوونە دوو بەشەوە دوو جەماعەت جیابوون (مەلاییو جەلالی)[٣٣] بەدوای یەکا ئەگەڕانو تەقو تۆق هەبوو، لە نزیك ئێمەیش ماوەیەك (سەید تایر)[٣٤] لە تەکێی جەباری مەقەڕی دانابوو وابزانم ئاید جەلالیەکان بوو. مەلایش لێرە زۆر بوون، بۆیە زوو زوو بەر ئەبوونە گیان یەکتری، ئاخر نەگبەتی کورد بوو ئەگینا هەمووتان کوردو هاوزمانو هاوخوێن یەکتری بوون بۆچی یەکتریتان ئەکوشت. ئەوەنەی لەیەکیان کوشتو راو یەکتریاننناو ئەوەنەی بەدوای یەکترییەوە بوون، ئەوەنە بەدوای حەرەس قەومییەکانو حکومەتەوە بونایا هەق کوردیان سەندبوو. ئیتر بۆیە سەرباری قورسیو سەختی ژیانی خۆمان ئەو مەترسیانەیشمان لەسەر بوو.

بەڵام کە من شوومکرد هەر سێ مانگێکی پێچوو ئیتر گشتی خەریك رێککەوتنو ئاشتبوونەوە بوون، خەڵك لە خۆشیا وەك جەژن بێ وابوو کەوتبوونە شاییو لۆغان ئەیانووت کورد ئاشتبونەتەوە[٣٥] و حکومەتو

---

[٣٣] -دوای لێکترازانی ساڵی ١٩٦٤ لەناو شۆڕشی ئەیلول بۆ دوو بەرەی سیاسی، لەناو کۆمەڵگا بە بەرەی جەلالی و مەلایی دەناسرانەوە، ئاماژەبوون بۆ هەردوو ئەو رەوتەی مەلا مستەفا و جەلال تاڵەبانی سەرکردایەتییان دەکرد.

٣٤ -تاهیر حوسێن محمد ١٩٣٤ – ٢٠١٤ تەکێی جەباری، سەرۆك عەشیرەتی جەباری و فەرماندەی بەتالیۆنی باڵی جەلالییەکان بووە لە ١٩٦٤ تا ١٩٧٠.

[٣٥] - ساڵی ١٩٧٠ ئاکۆکی نێوان هەردوو بەرەی جەلال و مەلایی کۆتایی هات و جەلالییەکان گەڕانەوە ناو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا بارزانی.

کورد ڕێککەوتوون[٣٦]. ژنو کچەکان دراوسێو ماڵە خزمەکان پێمیان ئەووت پێت بەخێربوو، هەر لەگەڵ بوکێنی تۆیا، ئاشووب بڕایەوە. حەفلەیە گەورەیانکرد لەودیوو کەرکوکەوە لای حەسار[٣٧] ناوشوان، وتیان مەلا مستەفا[٣٨] دێ بۆ ئەوێ خیتاب ئەدا. ئیتر زەلام ئاواییەکان هەموویان چوون بۆ حەفلەکەو هاتبوونەوە خەریکبوو لە خۆشیا هار ئەبوون مەلا مستەفایان بە ساغی بینیووە، چونکە پێشتر هەر لە ڕەسم دیبوویان. لەوەوە بۆ ماوەیەکی زۆر کێشەو شت نەماو خەڵکەکە گەشایەوەو کەوتینە زروفێ خۆشەوە. چەند ساڵێك بەو فەریحییە بردمانە سەر.

هەرچەنێ ئەو سێ چوار ساڵە خەڵك کەوتبوونە خۆشییەوە بەڵام ئێمە منالّمان نابوو دڵمان خۆش نەبوو، وەك ئێستایش نەبوو خەڵك بچێتە دکتۆر و چارەسەر بدۆزێتەوە دەچوینە لای شێخو مەلا نوشتەیان بۆمان ئەکرد. وابزانم چوار ساڵی پێچوو شوومکردبوو ئینجا خوا کردییە قسمەت کوڕێکمان بوو، بابای ناوی نا عومەر. چونکە زروفەکە خۆشتر

---

[٣٦] - ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عیراق.

[٣٧] - حەسار گوندێکە لە ناوچەی شوان کێشك ٨کم لە باکوری ڕۆژهەڵاتی ناوەندی کەرکوکەوە دورە، دوای ڕاگەیاندنی ڕێککەوتنی شۆڕشی کورد و حکومەتی عیراق، لە ڕۆژی ١٩٧٠/٣/٢٧ ئاهەنگێکی گەورە بە ئامادەبوونی مەلامستەفا بارزانیو جەماوەرێکی زۆری کوردستانیان لەو گوندە سازکراوە و لە یادەوەریی کورددا بە حەفلەکەی حەسار تۆمارکراوە.

[٣٨] - مەلا مستەفا، ئاماژەیە بۆ ناوی مەلا مستەفا بارزانی ڕابەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد

بوو شەڕ نەمابوو خەڵك دڵی خۆش بوو ئێمەش منداڵمان بوو ئیتر خۆمان و ماڵ غەزوریشم ئەوەندەی تر کەوتینە خۆشییەوە. بەڵام زۆری نەخایاند ژیانمان لێ تێکچووە، رێککەوتنی نێوان حکومەت و پێشمەرگە تێکچوو، شەڕ دروستبوەوە. خوا ئاگادارە ئەتووت هەر بۆ نەهامەتی خولقاوین لەگەڵ پەیابونەوەی تەق و تۆق و ترسەکەیا بێ ئەوەی نەخۆش بێ یان شتێ کوڕەکەم لە دوای چوار مانگ لەپڕ مرد. یاخوا کەس جەرگی نەسوتێ، بەخوا ئێستایش سوێی وا لە جەرگمایە، یاخوا بەنسیب کەس نەبێ بە دوژمنیشەوە. ئازاری جەرگ سوتان هەمووی یەکە بەڵام بەکاڵتە نەوتراوە مەرگی (کوڕ گەورەو کوڕ بیچك) لەبیر ناچنەوە. بۆ بەدبەختی و کڵۆڵی من تۆبەرەکەم ئەوکاتە مردو دوا کوڕیشم لە ئەنفالەکە بەڕەزالەت و بەدەم برسێتی و ژانەوە لە باوشما گیانی دەرچوو.

ئیتر ماڵ وێران بوویمان رۆشناییمان لێبڕیا. ناخۆشی لە هەموو لایەکەوە رووی تێمان کردەوە. جەیش ئەهاتنەوە سەر گوندەکان، ئێمەیش چونکە نزیك بووین زۆرتر ئەهاتن، کۆمەڵێك خەڵك ئاواییان گرت بردیانیانە کەرکوك ماوەیەکی زۆر سجن بوون، یەکێکیان ناوی (عەبدوڵا)[39] بوو نازانم چیانلێکردبوو، نان و ئاویان نەدابووپێی، ئەگەر لێیان دابوو، ئەوەیان لە سجنەکەیا دایکی کوێرێ گیانی دەرچوو بوو

[39] -عەبدوڵا غفور لە ساڵی ١٩٧٤ لە مامشە دەستگیرکراوەو لە ئەمنی کەرکوك لەژێر ئەشکەنجەدا مردووە.

مرد. هەر ئەوکاتانە بوو ئەوەنەی نەخایاند شۆڕش تاوایەوە[٤٠] پێشمەرگە گشتی هاتنەوەو دەچوونە لەیلانو کەرکوک تەسلیم دەبوونەوە، ترسو ناڕەحەتییەك بەرۆکمانی گرت هەر مەپرسە، ئەتووت خۆڵ جەهەنم کراوەتە سەرمانە.

ئەو ماوەیە تروسکاییەك رووناکیت شك نەئەبرد، هەروا مەینەتی بوو بەدوای یەکتریا ئەهاتن، خەڵکەکە ئەترساین ئەیانووت سەدام کورد رەوانەی شارەکان ناو عارەبسان ئەکاو عارەب دێنێ بۆ کەرکوك. لای ئێمە نا بەڵام باس ئەکرا لەناو شار دەستیپێکردووە عارەبی زۆریان هێناوە، کوردەکان بە بیانووی ئەوەی پێشمەرگە بوونە نەفییان ئەکەن بۆ جنوب. ئێستا هەموو جار بیر لەو رۆژگارانە دەکەمەوە ئەڵێم بەخوا ئەو خەڵکە هەمووممان زۆر چاو قایم بووین وا بەرگەی ئەو رۆژە رەشانەمان گرد.

ئیتر ئەو چەند ساڵەی دوایی هەتا ئەنفالەکەیشمان بەسەردا هاتو هەتا ئیستایش هەر نەحەساینەوە، ئێستاش ئەوەتا ژیانمان هەر مەینەتییە وانەزانی ئیستا ئیسراحەتمان کردبێ. دوای تاوانەوەی شۆڕش مێردەکەم ناوی هاتەوە بۆ عەسکەریی، وابزانم نزیك سێ ساڵو چەند مانگێ عەسکەر بوو، ئەوکاتە هێشتا شەڕی ئێرانو عێراق هەڵنەگیرسابوو. لەو

---

[٤٠] - بەهاری ساڵی ١٩٧٥ سەرکردایەتی ئەوکاتی شۆڕشی ئەیلول، کۆتایی شۆڕشی راگەیاند. لەیادەوەری خەڵك و ئەدەبیاتی کوردیدا بە تاوانەوەی شۆڕش، ئاشبەتاڵ، هەرەس، نسکۆ، شکستی شۆڕش، تۆمارکراوە.

ماوەیە هەرچەند نۆبەرەکەمان خوا بردییەوە بەڵام کچێکمان بوو، ئەوکاتە باوکیشی سەربازیی تەواوکردبوو ئیتر کەوتینەوە ژیانی ئاسایی خۆمان لە ئاوایی مامشە، وەك خەڵکەکەی تر ژیانێکی سادە بە مەڕداریی‌و کشتوکاڵکردنەوە خەریکبووین‌و لە ژیانی خۆمان رازیبووین. پێشمەرگە پەیا بوو بووەوە هەرچەند ئەوکاتە هێشتا نەگەیشتبوونە لای ئێمە چونکە ئێمە زۆر نزیك بووین لە حکومەتەوە، بەڵام دەنگ هەبوو پێشمەرگە پەیا بۆتەوە. ئیتر ئەمانبینی تەیارەی کۆپتەر بەسەرمانا ئەڕۆیی‌و جار جار قافڵەی جەیش لە لەیلانەوە تێئەپەڕین ئەڕۆیی بۆ ناو زەنگنە بۆ لای قادرکەرەم‌و ناو قەرەحەسەن، ئەیانووت شەڕو شۆڕ دەستیپێکردۆتەوە. چونکە پێشتر ماڵوێران بووبووین زۆر لە شەڕ ئەترساین. لە هەر شوێنێ هەواڵێ هەبوایا جەیش چووتە سەر ناوچەیەك یان گوندێکیان سوتاندووە بۆ ئێمە خەم‌و خەفەت بوو، چونکە خۆمان ماڵ رمیابووین ئەمانزانی بۆ ئەو خەڵکە چی بەدبەختییەکەو ئەیشترساین ئەمانووت هەمیسان هەموو مەنتیقەکە دەگرێتەوەو ئێمەش دەربەدەر دەبینەوە.

ئیتر ئەو ماوەیە هەواڵێ خۆش نەبوو، پیاوەکان ئەچوونە شار ئەهاتنەوە ئەیانووت حکومەت لە حدود کۆمەڵێك گوندی روخاندووەو خەڵکەکەی

گواستۆتەوە بۆ ئۆردگا[٤١]. جارێتر ئەچون‌و ئەهاتنەوە ئەیانووت لە کەرکوك کورد ئەنێرێ بۆ ئەو خوارە بۆ ناو عارەبسان[٤٢] بۆ رومادی[٤٣] و ئەو ناوە. ئیتر شەوان میوانێ بهاتایا یان بچوینایەتە ماڵە دراوسێیەك هەموو قسەوباسەکان هەمووی ناخۆش بوو. بۆ نەگبەتی هێشتا ئەم شەڕو شۆڕانە تەواو نەبوو بوو لە رادیۆ بڵاو بوویەوە عێراق‌و ئێران بووەتە شەڕیان.

یەکەم جار خەبەرەکە بڵاو بوەوە زەلام ئاوایی پێیان خۆش بوو، ئەیانووت ئێران خیانەتی لە شۆڕش کورد کردووە[٤٤] ئیشەڵا خوای کورد هەردولایان بەدەست یەکتریی مەحف ئەکاتەوە. بەڵام ئێران‌و عێراق هەر مانەوەو خەڵکەکەی ئێمە هەموومان بووینە سوتەمەنی ئەو شەڕەی ئەوان، ئێمە مەحف بووینەوە نەك ئەوان.

---

٤١ - لە نیوەی دووەمی حەفتاکاندا حکومەتی عیراق چەند ئۆردوگایەکی دروستکرد لە نزیك ناوەندی شارە گەورەکان، گوند و شارۆچکە سنورییەکانی راگواست بەبیانوی دروستکردنی ناوچەی ئارام، خەلکەکەی لە ئۆردوگاکان نیشتەجێکرد.

٤٢ - لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بڕیار لەسەر دروستکردنی دەولەتی عیراق درا بە پێکەوە لکاندنی ویلایەتەکانی بەسرەو بەغداو موسڵ، ویلایەتی موسڵ باشوری کوردستانی دەگرتەوە، هەردوو ویلاتەکەی تر وەك ناوچەی عارەبستان ناودەبران، بۆیە ئێستاش خەلکە بەتەمەنەکانی کورد ناوچەکانی تری دەرەوەی کوردستان بە عارەبستان ناو دەبەن.

٤٣ - ناوەندی پارێزگای ئەنبارە، ١٠٨ کم دەکەوێتە رۆژئاوای بەغدای پایتەختی عیراقەوە.

[٤٤] - رێککەوتنی ئێران و عیراق لە جەزائیر، کە عیراق دەستبەرداری بەشێك لە خاك و ئاوی عیراق بو بۆ ئێران بەئامانجی ئەوەی ئێران هاوکاری شۆڕشی کورد نەکات دژ بە عیراق، لە یادەوەریی کورددا ئەمە وەك خیانەتی ئێران لە کورد تۆمارکراوە.

مێردەکەم جارێکی تر بانگ کرایەوە بۆ عەسکەری، ئەمە دووەم جاری بوو بەدبەختە بکرێتەوە عەسکەر. ئاخر ماڵوێرانییەکە ئە لەوێ بوو کە شەڕ دەبوو ئەگەر شەڕەکە لە نزیک ئێمەش نەبوایا زەلامەکان ئەکرانە عەسکەرو ئەبران بۆ شەڕ، ئیتر لە ئێران‌و تورانیش بوایا وەك ئەوە وابوو شەڕەکە لەناو ماڵەکەی تۆبێت، دایمە دڵمان لە مشتمانا بوو هەواڵمان بۆ دێتەوە زەلامەکانمان لە شەڕا کوژراون. تەلەفیزیۆنەکەیش[٤٥] هەموو ئێوارانێ وەك فەرز ناو شەڕەکانی پیشانئەدا جەنازەی دنیا لەو عەردە کەوتووەو کەس دەست نابات جەنازەیەك هەڵگرێتەوە، ئیتر ئەوەنەی تر بار دڵمان گران ئەبوو، کە هەواڵی کوشتنی کەسوکاریشمان نەهاتایا هەر ئەترساین ئەمانووت کێ نالێ نەکوژراون‌و لەناو ئەو جەنازانەیا نین.

ئەوکاتە کە محەمەد بووەوە عەسکەر بێجگە لە کچەکە خوا کوڕێکیشی پێبەخشی بووین ناومان نابوو ساڵەح، بەناو خاڵۆیەوە ناوم نابوو. هەروا چەند مانگێ بوو شەڕی ئێران‌و عێراق هەڵگیرسابوو ئەو لەدایکبوو. هەرچەندە باوکی کاتی عەسکەری خۆی تەواوکردبوو، ئەوکاتە هەموو زەلامێك کە دەبووە هەژدە ساڵ دەبو چەند ساڵێك بچێت بۆ عەسکەری. بەڵام کە شەڕ دەستیپێکرد ئیتر جارێکی تر بەپێی مەوالید بانگکرانەوە بۆ عەسکەریی، نازانم ئەحتیاتیان پێیانئەووت شتێ وابوو. هێشتا هەر

---

[٤٥] - ئەوکاتە تەنها کەناڵی تەلەفزیۆنی رەسمی دەوڵەت هەبوو، لە بەغدا و لە کەرکوك. بەشێکی زۆری بەرنامەکانی کەناڵی کەرکوك بە زمانی کوردی بوو، لێرەدا (تەلەفیزیۆنەکە) ئاماژەیە بۆ کەناڵی کەرکوك.

عەسکەر بوو خوا منالێکی تری پێداین دوو ساڵێك دوای ساڵەح، ئەویش هەر کوڕ بوو ناومان نا عەبدولڕەحمان. ساڵو شتێ دوای ئەویش کوڕێترمان بوو، ئەمەمان ناونا ئارام. چوار پێنج مانگێ پێش دێرمیانەکەش خوا کوڕێکی تری پێداین کە ئەنفالەکە بوو تەمەنی هەر ساڵو نیووێك بوو، ئەومان ناو نابوو نەهرۆ. پێشمەرگەکان ئەم دواییە ناو کوردیی خۆشیان لە خۆیان نابوو بۆیە ئیتر خەڵکیش کە منالی دەبوو بەو ناوە کوردییانەوە ناومان ئەنا. ئێمە ئەم دووانەی کۆتایمان ئارامو نەهرۆ بەناو دووان لەو پێشمەرگانەوە ناو نابوو. نەهرۆ دایکی کوێر بێ بە رەزالەتەوە مرد. کە دەستگیریش کراین دوو سێ مانگێك بوو دووگیان بووم لە زیندان کچێکم بوو، (فێنك) شوکر ئێستا ئەویش ماوە خوێندنی تەواو کردووەو بووەتە مامۆستا.

ئەو چەند ساڵەی شەڕ بوو تا ئەنفالمان بەسەرداهات ژیانمان هەمووی هەر سەخت بوو. باوك منالەکان کرابووە عەسکەر ئەمجارەیش سێ ساڵو چەند مانگێ لە عەسکەریی مایەوەو دوای ئەوە جارێکیتر تەسریح بوو. ئینجا لە دایەرەی ئیشغالێ لە کەرکوك دامەزرا سایەق شۆفلێ بوو. بەڵام بەخوا هەروەك ئەوەی عەسکەریێو لەناو شەڕ بێ دڵمان دایەمە لە مشتمانا بوو چونکە زروفەکە بۆ کورد ناخۆش بوو، بەیانی ئەڕۆیی بە تەمای هاتنەوەی نابووین تا ئێوارە، ئەمە هەر بۆ ئێمە وانەبوو ئەوکاتە هەموو خەڵکەکە وەك یەك وابووینو بۆ هەمومان ناڕەحەتی بوو. هەر ئەوە نەبوو ئێمە لە لادێ بووین بۆیە وابێت بۆ خەڵك شارەکان خراپتر

بوو. ئێمە هیچ نەبێ بەردەوام حکومەت بەدیارمانەوە نەبوو، بەڵام ئەوەی ئەوکاتە لە شارەکان بوو وەك ئەوە وابوووماڵی لەناو مەعەسکەرەکە بێت. چواردەور شار هەمووی کرابووە مەعەسکەرو دایەرەو مایەرەی ئەمنو حکومەتیش بەبان سەریانەوە بوون. خزمەکان هەنێکیان لە کەرکوك بوون شەو رۆژ بە تەمای خۆیان نەبوون. ئەگەر هیچ ترسێ تریشیان نەبوایا دایەمە ئەترسان موختار بێتە قاپیو بڵێت ئەوە ناوتان دەرچووە بۆ (تەرحیل)[٤٦].

ئیتر خۆمانو قسمەتمان چارەنوسمان کەوتە ئەو رۆژگارەوە شەو و رۆژمان بە خەفەتو مەینەتی ئەدایە دەم یەك. ئێستا هەنێ دێ هەبوون دویر بوون لە حکومەتەوە ئەوان باشتر بوون تەنیا ئەوکاتە لێیان قەوما کە ئەنفالەکە بوو ئەویش عامە بوو هەموو خەڵکەکەی گرتەوە. ئێمە چونکە نزیك بووین زۆرتر لە مەترسیابووین هەر لەگەڵ (لەیلان)دا ئەوەنەمان بەین نەبوو بەسەیارە دە دەقە ئەگەر بۆ چارەکە سەعاتێ دویر بووین. ئێ لەیلانیش نزیك گامێشەکان[٤٧] بوو، شوێنێ بوو

---

[٤٦] - تەرحیل – راگواستن، یەکێك لە سیاسەتە بەرچاوەکانی رژێمی بەعس و حکومەتی عیراق بوو لەنێوان ساڵەکانی ١٩٦٨ تا ٢٠٠٣ پەیڕەوکراوە بۆ کەمکردنەوەی رێژەی دانیشتوانی کورد و زیادکردنی رێژەو پێگەی عەرەب لەو ناوچانەی کوردستان کە سیاسەتی تەعریبیان تیا پەیڕەوکراوە.

[٤٧] -گامێشەکان کۆمەڵگەیەکی نیشتەجێبوونی بچوك بوو لەسەر رێگەی کەرکوك بە تەنیشت ناحییەی لەیلانەوە.

پێیانئەووت گامێشەکان لەوێش ماڵ (تەحەی شاوە)[٤٨] و ئەوانە لەوێ بوون چەکدار حکومەت بوون، بەو هۆیەوە دێیەکەی ئێمە مەترسی زیاتری لەسەر بوو. چونکە پێشمەرگەیش جارجار ئەهاتن بە شەو خۆیان ئەکردە ئاوایبا، جەماعەت مامەڕیشە[٤٩] بوون. تاوێ ئەمانەوە نانێ شتێکیان ئەخوارد یان ئەپەڕینەوە بۆ ئەو بەر بۆ پشت لەیلانەوە ئەچوون چالاکیو شەڕیان ئەکرد، ئیتر بۆ بەیانی حکومەتو جاش ئەهاتن ئەیاندایە سەر ئاوایبا، ئەچوونە گیان ماڵەکان لە خەڵکەکەیان ئەداو ئەیانووت پێشمەرگەتان شاردۆتەوە، یان ئەیانووت نانتان داوەتە پێشمەرگە. وایی لێهاتبوو ئیتر کە پێشمەرگە ئەهات هەموو خەڵك ئەیزانی بەیانی زوو جاشو جێشەکە دێتە سەرمان بۆیە هەر بەدوای ئەوەی پێشمەرگەکان ئەڕۆیشتن ئیتر خەڵکەکەیش دەبوو رابکەینو ئاوایی چۆڵ بکەین بەتایبەت گەنجەکان. ئەچوون خۆیان ئەشاردەوەو دوای رۆژێ دووان ئەهاتنەوە. بەم دوادوایە وایلێهاتبوو نەك هەر زەلامەکان ئەبوو ژنو منالێش لە ترسا ئاوایی چۆڵبکەین. چونکە حکومەتەکە زاڵم بوو. پێشتر پیرەژنو پێرەمێرد لە جەیشو جاش

---

[٤٨] -تەحسین شاوەیس سعید ١٩٥٣- ١٩٩٦ لەیلان سەر بە ناوەندی قەزای کەرکوك لەدایك بووە، مستەشاری فەوجی ١٧٢ جاش بووە.

[٤٩] -نەجمەدین شوکر رەوف ناسراو بە مامەڕیشە ١٩٥٢ گوندی تاڵەبان سەربە قەزای چەمچەماڵ. فەرماندەی کەرتی ٤ی جەباری هێزی پێشمەرگەی ی،ن،ك ساڵی ١٩٨٥ لە کاتی گفتوگۆی نێوان یەکێتیی و بەعس ، بەپیلانێك لەلایەن تەحسین شاوەیسەوە لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تردا شەهیدکرا.

ناترسان‌و ئەیانووت حساب بۆ ئەوە دەکەن ئەمانە بەتەمەنن، بەڵام دوای وایلێهات حکومەت فەرقی لەنێوان گەنج‌و پیر ناکرد. بەخوا لەنێوان پێشمەرگەو ژن‌و منالْ ئاوایش فەرقی ناکرد، فەرقی بکردایا وای بەسەرمانا ئەهاورد؟ ژن‌و منالْ چی تاوانێکیان هەبوو تا گشتیان بە زنوێتی بخەیتە ژێر خۆڵەوە.

چەند جارێك شەڕو تەق‌و تۆق لە نزیکمان‌و لە ئاوایی روویدا. ئیتر شەو بوایا رۆژ بوایا هاوین بوایا یان زستان بە سەرماو گەرما کە پێشمەرگە ئەهات ئەبوو بەدوای ئەوانا ئێمەیش رابکەین، چونکە نزیك بووین لە لەیلانەوە پێشمەرگەکان بە زۆری بەرۆژ ناهاتن مەگەر ئەوکاتەی خەریك رێککەوتن بوون لەگەڵ سەدام، وەکتر شەوان ئەهاتن. دەبوو ئێمەیش نیووە شەو یان دەمەو بەیان ئاوایی چۆڵ بکەین. جارێکیان دوو سێ ساڵێ ئەبوو شەڕ ئێران‌و عێراق هەڵگیرسابوو مامەڕیشە هاتە ئاوایی، زستان بوو باران ئەباری، ئینجا ئەگەر هەورو باران بوایا کۆپتەرەکە کەمتر هەڵئەسا، ئیتر نازانم مامەڕیشەو ئەوانیش حساب ئەوەیان کرد بوو کە بارانەو رەنگە جەیش‌و جاش نەیەن، بۆیە رۆژ بوو خۆیان کردە ناو ئاواییا، نازانم لە شوێن ترەوە هاتبوون، حکومەت زانیبووی وان لەوێ یان چی بوو، کاتێکمان زانی جەیش‌و جاش پەیا بوون لای ئێمە و لە تەپەلوو[٥٠] بووە شەڕ. لەناو دێیەکە تەق‌و تۆق‌و زرمەی تۆپ هەر

---

[٥٠] - تەپەلو گوندێکە سەر بە شارۆچکەی لەیلان دەکەوێتە باشوری رۆژهەڵاتی پارێزگای کەرکوکەوە.

خەریکبوو زراومان بچێت، منالّ هەمووی لە ترسا قیژوقاوی بوو. گێڕانەوەی هەر بەدەم ئاسانە، وەرە لەناو کولبە خانوویەکابە منالّ هەمووی لەترسا خۆی ئەخاتەژێر دەستوپای تۆوە وایان ئەزانی ئەگەر بێنە ژێر کراس‌و کەواکەی تۆوە ئەوە تۆپ کاریان تێناکات. لە نیوەڕۆوە شەڕ دەستیپێکرد هەتا شەو داهات. لە هەر کوێ شەڕ بوایا بە ڕۆژ شەڕ دەبوو کە تاریك دائەهات جەیش‌و جاشەکە لە ترسا ئەگەڕانەوە. شەو داهات‌و تەقەمان لەسەر نەما، وتیان کۆمەڵێ جاش‌و عەسکەری کوژراون‌و کۆمەڵێ پێشمەرگە لە مامشەو تەپەلو بریندار بوون، یەکێ لەو پێشمەرگانە هەر خەڵك ئاوایی خۆمان بوو ناوی (دلاوەر)[51] بوو، بەدبەختە ئیستاش ماوە هەر ها بەبان عارەبانەوە لەو ولآتانەیە لە خارج.

ئەترساین وتمان حکومەت بەیانی ئەداتەوە سەرماناو تۆڵە لە ئێمە ئەکاتەوە، پێشمەرگەکان ڕۆیشتن‌و خەڵکی ئاوایش لە ترسا ناچار بووین ڕەو بکەین. جا وەرە بیهێنەرە پێشچاو خۆت منالّ کۆرپەی شیرە خۆرەو کورە ئەوەکانی تریش ئەوەنە گەورە نەبوون تا لەخەم دەرچووبن، نە سەیارە هەبوو نە تەرەکتەر، لە دێیەکە سەیارەو تەرەکتەر هەبوو بەڵام ئەترساین ئەگەر بە سەیارەو تەرەکتەر بڕۆین حکومەت وابزانێ پێشمەرگەیەو بمانداتە بەر تۆپ، بۆیە هەموو بەپێ

---

[51] -دلاوەر نازناوی محمد قادر سالّحە سالّی ١٩٥٧ لە مامشە لەدایك بووە لە ١٩٨١ بووەتە پێشمەرگەی ی،ن،ك لە ١٩٨٣/٦/٢٨ بریندار کراوە و تا ئێستا چارەسەری تەواوی بۆ نەکراوە.

کەوتینەڕێ. بەو دەشتو دەرەیا ڕێمانکرد هەتا ئەگەیشتینە (تەپەسەوز)[٥٢]، ئەو دوورتربوو لەبان (ڕۆخانە) بوو لە بنار (جەوەڵ ناسان)[٥٣]، چووین لەوێ خۆمان شاردەوە. بەیانی درەنگانێ هاتینەوە ئاوایی هەندێ لە پیرەکان لە ماڵ مابوونەوە وتیان جەیشو جاشێ زۆر هاتوون وتوویانە پێشمەرگەی بریندارتان شاردۆتەوە، کەوتوونەتە گەڕان بەدوای چەکو چەکدارا، ماڵەکانیان گشت داپشکاندبوو. باش بوو ئەو جارە کەسیان نەگرتبوو.

لەدوای ئەو شەڕەوە ئەوەنەی پێنەچوو نزیك ساڵێ وەزعەکە باش بوویەوە نازانم ئەیانووت (مفەوەزاتە)[٥٤] مام جەلال[٥٥] چووەتە بەغداو سەدامی بینووەو وتویانە با ئیتر ئەم کوشتوبڕە نەمێنێ. وەڵا لەدوای ئەوە ئیتر ماوەیە حەساینەوە نە کۆپتەر ما نە ترسی جێشو جاش. ئەوانەی فیراریش بوون قلەقلە ئەچوونە شارو ئەهاتنەوە. پێشمەرگە بە ئیسراحەت بە ڕۆژ نیوەڕۆ ئەهاتن بۆ ئاوایی‌و ئەمانەوەو ترسیان نەبوو حکومەت بێتە سەریان. بەڵام ئەوەنەی پێنەچوو ئەها ئەو ساڵەی (ریشە)[٥٦] کوژریا، چونکە بە غەدر کوشتیان ئیتر دوای ئەوە ئاگر کەوتە

---

٥٢ - تەپەسەوز گوندێکە لە تەنیشت گوندی مامشە، سەر بە شارۆچکەی لەیلانە.

[٥٣] - جەوەڵ ناساز، چارەکە ڕێگەیەك لە گوندی مامشەوە دورە و زۆرجار بۆ خۆحەشاردان پەنایان بۆ بردووە.

[٥٤] - مفاوەزات، دەستپێکی گفتوگۆی نێوان ی،ن،ك و حکومەتی عیراق کۆتایی ساڵی ١٩٨٣

[٥٥] - مام جەلال، جلال حسامەدین تالەبانی ١٩٣٣ – ٢٠١٧ سکرتێری گشتی ی،ن،ك

٥٦ - ریشە، ئاماژەیە بۆ ناوی (نەجمەدین شوکر ڕەووف) ناسراو بە مامەڕیشە.

وڵاتەکەوە. مفاوەزاتەکەیان تێکچوو پێشمەرگە کەوتنە تۆڵەکردنەوەی ریشە، حکومەت کەوتە پەلاماردان دێهاتەکان، بە شەوو بە رۆژ ئیتر تۆپباران لادێکان ئەکرا. لە هەر دێیەك شەڕ بوایا حکومەت جیاوازی لەنێوان پێشمەرگەو ژنو منالیش ناکرد.

پێشتر ئەگەر پێشمەرگە بهاتایەتە ئاوایی، ئێمە ئەترساین ئەمانووت حکومەت دێتە سەرمان، بەڵام ئیتر پێشمەرگە بهاتایا یان نا، جەیشو جاش هەر ئەچوونە سەر لادێکان. بەدوای فیرارا ئەگەڕان، گەنجیان ئەگرد ئەیانووت ئەمانە هێزی پشتگیرین[٥٧]، یەعنی پشتگیریی پێشمەرگە ئەکەن. ئەو دێیانەی نزیکەو شار بووین زوو زوو ئەیاندایە سەرماندا، بیرمە جارێکیتر هاتن گەیشتنە ئاوایی ئینجا خەڵکەکە پێیزانی کەس فریا نەکەوت رابکەنو لەو کەلوەزو هەردانە خۆیان بشارینەوە. کوڕێك ناوی (عەلی)[٥٨] بوو خەڵك شار بوو لە ترسا هاتبووە مامشە کە جەیشو جاشەکە ئەبینێ لە ترسا رائەکات خۆی ئەکاتە ژێر خەرمانێ گەنمەوە، بە ناقیلە دوای کەوتن گرتیانو بردیان، هەردوو گوێچکیان بڕیی بوو گوێیەکانیان هێنا پیشان خەڵکەکەیان ئەدا ئەیانووت ئەوەی بیەوێ لە

---

٥٧ - لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی بیستەم بەهۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر گەنج و لاوی کورد بۆ خۆدزینەوە لە چونە سەربازی لە سوپای عیراق و لە ترسی گرتن و راوەدونان لە شارەکان، روویان لە گوندەکانی ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان کردبوو. سەرکردایەتی ی،ن،ك یەکەیەکی تایبەتی هێزێکی نارێکخراوی وەك هێزی پشتگیری دروستکرد بۆ پاراستنی گوندەکان و لە هەندێ شەڕیشدا وەك پشتیوانی پێشمەرگە بەشداری شەڕی دژی جاش و سوپایان دەکرد

٥٨ - عەلی محیدین هاوڵاتییەکی کەرکوك بووە و بە فیراری چووەتە مامشە.

ئێمە عاسی بێت ئاوای لێئەکەین. هەنێ خەڵك ئاواییان دەستگیرکرد. پێشتریش زۆرجار ئاوا خەڵکیان گرتووە، پێش ئەوەی من شوییان پێبکەم غەزورم دووجار گیرا بوو کە منیش بوکیان بووم جارێك گرتیان بەخوا بیست شەو سجن بوو لەو کەرکوکە. لە شەستو سێ وە ئەو خەڵکە نەحەساینەوە، بەشمان هەر راکەراكو مەینەتی بوو.

ئیتر ئەو چەند ساڵە ئێمە ئەمە حاڵمان بووە هەتا ئەوکاتەی ئێرانییەکانیان هاورد لە نەوتەکەی کەرکوکیان دا[٥٩]. پێشمەرگە هاتن کۆمەڵێ پاسدار ئێرانییان لەگەڵ بوو دایان لە نەوتەکەی (زەمبور)[٦٠]. بۆ نەگبەتی دێیەکەی ئێمە وەك لە حکومەتەوە نزیکبوو لە جەوەڵ بۆریشەوە هەر نزیکبووین ئەوێ نەوتی لێبوو. ئەو لە حدود ئێران شەڕی بوو، ئێستا ئێران گەیشتبێتە کەرکوك ئەبێ چی بکات. بۆ بەیانی جەیشو جاش لە سەر زەویو کۆپتەرو تەیارەیش بەو ئاسمانەوە کەوتنە گەڕان، ئێمە خۆمان هیچمان نەبینی بەڵام وا بڵاوبووەوە کە لای (تاوێربەرز)[٦١] لەولای دێیەکەی ئێمەوە قەوان ساروخو تۆپەکانیان دۆزیووەتەوە، تومەس بەوەیا زانیوویانە ئەمانە ساروخو تۆپو تفاق

---

[٥٩] - لە :١٩٨٦/١٠/٢ لە ئۆپەراسیۆنێکی هاوبەشدا سوپای پاسدارانی ئێرانو هێزی پێشمەرگەی سەر بە ی،ن،ك بە موشەكو کاتیۆشاو تۆپی دورهاوێژ لە چەند کێڵگەیەکی نەوتی کەرکوکیان دا.

٦٠ - زەمبور (جەمبور) یەکێکە لە کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوك دەکەوێتە باشوری رۆژهەڵاتی شارەکەوە لە ساڵی ١٩٥٩ نەوتی لێبەرهەم دەهێندرێت.

٦١ -تاوێربەرز یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی جەباری دەکەوێتە باشوری رۆژئاوای شارۆچکەی تەکییەوە، نزیك شارۆچکەی لەیلان لە پارێزگای کەرکوك.

ئێرانییه. کاکه ئیتر حکومەت هەر هاروشێت بوو. شەوو ڕۆژ کۆپتەرو تەیارە بەو ئاسمانەوە ئەهاتنو ئەچوون هەروا جەیشو جاش بوو فڕکان فڕکانیان بوو. وایلێهات شەوانە لایتی سەیارەیەك لە هەر کوێیەك دیاربوایا لە کەرکوكو لەیلانەوە ئەیدایە بەر تۆپ. بە ڕۆژیش کۆپتەر بەو ئاسمانەوە بوو تەرەکتەرێ سەیارەیەك لە هەر دێیەکەوە دەرچوایا تەقەیان لێی دەکرد. کۆپتەر تەنانەت شوانو گاوانیشی ئەکوشت، تەرەکتەر بچوایا بۆ جووتکردن، دەڕاسە لە کاتی درەوکردن، خەڵك لەسەر زەرعات، لە ڕێگاوبان، لەکوێ خەڵکی ببینیایا ڕەمی دەکرد. ئیتر ژیانمان تێکچوو کەوتنینە ڕەزالاتێکەوە هەر مەپرسە.

خەڵکەکە ئەیانزانی قورمان بۆ گێراوەتەوەو ئەمجارە تیایا دەرناچین. چونکە تەلەفیزیۆن هەبوو شەوانە لە تەلەفزیۆن ئەمانبینی حکومەت هەر خەریك کۆبونەوەو خڕکردنەوەی جەیشو جاش بوونو هەڕەشەیان ئەکرد. ڕۆژانە خەڵك هەندێکی بۆ کارو کەسابەت دەچوونە کەرکوك، هەواڵیان دەزانی. خۆ قسەیە خراویش هەبوایا جێوەجێ بەناو ئاواییا بڵاو ئەبوویەوە. وتیان حکومەت هەموو دێیەکان دەور کەرکوكو نزیکەو جادەکان ئەڕوخێنێ. تەلەفیزیۆنەکەی سەدام هەر شیرە شیڕی بوو. رادیۆکەی یەکێتیش[٦٢] ڕۆژانە لەهەرکوێ هەواڵێ هەبوایا ئەیخوێنەوە، گوێمان لێی دەگردو دەمانزانی ڕۆژانە کۆپتەر تەقەی لە سەیارەو

---

٦٢ - رادیۆی یەکێتیی: سەرەتا بەناوی ئێزگەی شۆڕشی عیراق لە ١٩٧٩/٣/٢١ دامەزراوە، دواتر ناوی گۆڕدراوە بە دەنگی گەلی کوردستان.

تەرەکتەرو لە شوانو گاوانی ئاواییەکان دەکرد. شەڕ بە توندی کەوتەوە مەنتیقەکە.

ڕۆژێك کاتێکمان زانی جەیش هاتنە ئاوایی هەر خەریکبوو چاومان دەرکەن ئەوەنە توندوتیژ بوون، کەوتنە ئیهانەکردن ژنو منالّو زەلام ئاوایی. ئەیانووت جەیش (بارق)ن[٦٣]، ئەوەی کۆپتەرە هارەکەی هەبوو، ئەتووت زەردەواڵەیە بەو ئاسمانەوە هەر دەرئەکەوت هەموو ئەمانزانی ئەوە کۆپتەرەکەی بارقە. ئیتر ئەمانووت بەخوا شتێك خراپ ئەبێ، چونکە هەر جارێ ئەو کۆپتەرە ڕۆیشتبێ، ئێوارە هەواڵ ئەهاتەوە لە فلانە گوند خەڵکی کوشتووە، ئەگەر کەسی دەست نەکەوتایا تەقەی لە ئاسکە کێوی ئەکرد ئەیکوشت.

ئیتر ئەوەنەی پێنەچوو لەدوای هاتنی پاسدارە ئێرانییەکان حکومەت کەوتە روخاندنی ئەو گوندانەی نزیك بوون لە جەیشو جادەو شارەکانەوە، هەمووی پێنج مانگ ئەبوو نابوو خەبەر هات وتیان بەیانی جەیش دەداتە سەرمانا، هێشتا هەر شەو بوو بەیانی نەدابوو ئەو خەڵکە هەموو دامانە ئەو دەشتو هەردەیا نزیك حەفتا ماڵ ئەبووین ژنو منالّو گەورەی ئەو حەفتا ماڵە ڕەومانکردو ڕوومانکردە ئەو دەشتو هەڵەتانە.

لە دوورەوە تەماشای ئاوایمان ئەکرد بزانین چی بەسەردێ. هەر یەکی

---

[٦٣] - بارق عەبدولّا حاج حنتە ئەلزوبەیدی ١٩٥٠ قەزایی سویرە لە پارێزگای واست لەدایك بووە. ئەرك و بەرپرسیارێتی جۆراوجۆری سەربازی وەرگرتووە، فەرماندەی لیوای پاراستنی نەوتی باکور بووە، دواتر بووە بە فەرماندەی لیوای قوات خاسە لە ١٩٨٥ تا ١٩٩١، لەسەردەمی بەڕێوەچونی پرۆسەی ئەنفالدا یەکێك لە بەرپرسانی ئەو پرۆسەیە بووە لەناوچەکانی کەرکوك.

قسەیەکی ئەکرد هەبوو ئەیانووت هیچ نییە ئەمجارەش وەك هەموو جارەکانی تر دێن ماڵەکان دەگەڕێن‌و هەندێ دزی‌و تاڵانی دەکەن‌و دەڕۆن، هەبوو ئەیووت بەخوا لەگەڵ زەویا تەختی دەکەن. لەکاتی لێقەومانیشا هەموو قسەیەك دەچێتە مێشکتەوەو باوەڕ بە هەمووی دەکەیت. دڵمان بەو قسانە خۆش دەبوو کە دەیانووت هەمووی چەند سەعاتێکەو ماڵەکانمان تاڵان دەکەن‌و دەڕۆن. ئەبێ کێ هەبێ پێی خۆشبێ ماڵی تاڵان بکرێت، بەڵام لەبەرئەوەی لە خراپتر ئەترساین بۆیە بەوە شوکر بووین هەر ماڵمان تاڵان بکەن‌و بهێڵن بچینەوە لەناو چاوە خانووەکانماندا بە کوولەمەرگی بژێین. لە پڕ یەکێ لەولاوە هاواری ئەکرد بەخوا ئیتر چاومان بە مامشە ناکەوێتەوە ئەوەتا دوکەڵ چوو بە ئاسمانا، دڵ‌و هەناومانی ئەخست. هەموو قسەیەکیش هەر کاری لێمان ئەکرد، یەکێ قسەیە باشی بکردایا هێز ئەکەوتەوە ئەژنۆمان‌و یەکێ قسەیە خراپی بکردایا ئەژنۆمان ئەشکا. زۆربەی خەڵکەکە باوەڕی وابوو دێیەکە ئەسوتێنن چونکە بیستبوومان چەند گوندێکی تریان روخاندووە لەو دەوروبەرە.

تازە بەیانی دابوو چاومان پێوە بوو جەیش دابارینە سەر ئاواییاو دوکەڵ بەرزەوە بوو. تەپ‌و تۆز ئەچووە ئاسماناو کەوتنە وێرانکردنی گوندەکەمان.[64] قاژەی جەرگمان دەهات لەوە ناخۆشتر نییە ماڵت وێران بکەن، ئێستا ئەگەر یەکێ خۆی بەسەری نەهاتبێ رەنگە نەزانێ ئازاری

---

٦٤ گوندی مامشە لە مانگی سێی ساڵی ١٩٨٧ لەلایەن حکومەتی عیراقەوە روخێندراوە.

ماڵ رمیان چەند ناخۆشە. جا وەرە خۆشت چاوت پێوەبێت ماڵەکەت وێران بکەنو هیچ دەسەڵاتێکیشت نەبێ. ئێمە بەچی حاڵێك ماڵمان پێکەوە نابوو، لە قوڕکارییو خشتبڕینو دیوارو دارەڕاو سەرسواقەوە بیگرە هەتا کەفماڵی دەرو ناوی خانووەکانی خۆمانو کەلاوەی مەڕوماڵاتو کولانەی مریشكو دوور لەڕووی ئێوە کولانەی سەگەکانیش هەمووی بەو دەستانەی خۆمان کردبوومان. چەند عەزابمان چەشتبوو خوایە تا دوو چاوە خانوومان نابوو بە یەکەوە، ئێستا ئاوا بە ئاسانی بە دەمە شۆفلێ ئەیڕوخێنن.

ئاخر ئەو دەمە شۆفلەی ئەوان وا بە ئاسانی لە خانووەکانی گیر دەکردو لەگەڵ زەوی تەختی دەکرد، ئێمە بە لەپی دەست خاكو خۆڵەکەیمان کۆکردبووەو بە دەستو پەنجەی خۆمان دروستمانکردبوو. کەنوویی رزقو عەماری دانەوێڵە، کونەڵانو سەرشۆرك بەخوا هەمووی بەدەستو پەنجەی خۆم دروستمکردبوو. ئەوکاتە وەك ئێستا نەبوو خەڵك پارەی نەبوو بچێت لە بازاڕ ئەوەی پێویستە بیکڕیت دەبوو خۆمان هەموو پێویستیەکان دروستبکەین. لە خانوو ماڵەوە بیگرە هەتا ئەشیای خواردن، جیا لە شەکرو چا هەموو زەخیرەیەك هین خۆمان بوو. لە نیسكو نۆكو پاقلەو ساوەر، دۆینە، کەشك، هەتا ئاردو رۆن، سەوزەواتی وشککراوە بۆ زستان، لە قەرەخەرمان. ئیتر ئەوەی بنیادەم پێویستێتی بۆ خواردن ئێمە خۆمان دەمانکرد. پێویستی ناوماڵیش لە لفکەی خۆشۆرینەوە بیگرە هەتا گوریسو رەشکەو جەواڵو جاجمو

لێفەو بەڕەو لبادو قاڵیو بەرماڵ هەمووی لە خوری مەڕو مووی بزن خۆمان دروستمکردبوو. بەخوا هەتا پوزەوانەو پەستەکو کلێتەیشم بۆ منالەکانو بۆ باوکیشیان دروستئەکرد، کڵاشیشم بۆی ئەچنی. ساڵانە کە مەڕمان سەربڕیایا بزنمان سەربڕیایا، یان قۆچمان بکردایا، زەلامەکان هەر ئەوەنە کەوڵیان دەکرد، ئیتر ئەبوو ئەو پێستەیە خۆش بکەم، (مەشکە)ی دۆو (کوونە)ی ئاوو (هیزە)ی رۆنم لێدروست دەکرد، باوەڕ ئەکەی مەشکەمان هەبووە لە پێستی جوانەگا دروستمکردووە، هەموو ساڵێ لە هەوەڵ بەهارەوە هەتا شیری مەڕ بڕاوەتەوە من هەموو رۆژێ مەشکەیە دۆم ژەنیووە. ئیتر میوانێ بهاتایا یان زەلامەکان بچونایا بۆ شار بۆ میوانی، مەتارە دۆو کەرەی خۆمان دیاری دەستیان بووە. ئەوەنە رۆن خۆمانەم لێدروست ئەکرد هەتا ساڵ هەڵگەڕاوەتەوە ئێمە هیزەیە دوان رۆن زیادە لەماڵمانا بووە.

ساڵانەش کە مەڕمان دەبڕییەوە خورییەکەیمان کۆدەکردەوەو جوان جوان دەمانشۆری. دوایی شیمان ئەکردەوەو هەڵمانئەخست هەتا بەجوانی وشك ئەبووییەوە، ئیتر رۆژانە چەنێ خەریکی ئیشی ناو ماڵو منال بووین، چەنێ بە دەرەوە بووین خەریکی مەڕ دۆشینو زەرعات بووین، مەگەر لەسەر تەنوور نان کردن دامنابێت، دەبوو ئەو تەشییەش هەر بەدەستمانەوە بوایاو دوو دەقە کاتمان هەبوایا تەشیمان دەڕێسی. بە فەردە گلۆڵە بەنمان دروستدەکردو بینێرە لە شار بە خووم رەنگیان ئەکردو شەوانە دەستماندەکردە چنینی ئەوەی پێویستمان بوایا. ئینجا

له سه‌رین‌و لێفه‌، دۆشه‌ك، هه‌موو ئه‌مانه‌مان به‌ زه‌حمه‌ت‌و ره‌نجێكی زۆر زۆر له‌ خوری دروستكردبوو. ئێستا وا به‌ به‌رچاومانه‌وه‌ هه‌مووی تالآن ئه‌كه‌ن. چاومان پێوه‌ بوو تا به‌رده‌كه‌ی ئه‌لحه‌دیش ئه‌خه‌نه‌ سه‌رمان هه‌ر له‌به‌رچاومان لاناچێ كه‌ چی زوڵمێكیان له‌ ئێمه‌ كردو ئه‌و ئاواییه‌یان والێكرد.

كه‌ گه‌ڕاینه‌وه‌ بۆ سه‌ر ماڵ‌و حاڵه‌كه‌مان، ئه‌گه‌ر خۆمان خه‌ڵكی ئه‌وێ نه‌بوایایه‌ن باوه‌ڕتناكرد ئه‌م دێیه‌ بنیاده‌می تیا ژیابێت، ئه‌تووت سه‌ت ساڵه‌ ئێره‌ چۆڵه‌و ئاوه‌دانی تیا نه‌بووه‌ وا وێرانیان كردبوو. ئه‌وه‌ی به‌كه‌ڵكیان هاتبوو به‌تالآنی بردبوویان، ئه‌وه‌یشی به‌خۆیان لازم نه‌بوو یان له‌گه‌ڵ خانوه‌كاندا كردبوویانه‌ ژێر خۆڵه‌وه‌ یان ئاگریان تێبه‌ردابوو هه‌موویان سوتاندبوو.

ئه‌و خه‌ڵكه‌ گشتی هه‌ریه‌كه‌ به‌ دیار كه‌لاوه‌ی روخاوو سوتاوی ماڵه‌كه‌یه‌وه‌ ده‌گریاو هاوارمان بۆ خوا ده‌كرد ئه‌و زوڵمه‌ قبوڵ نه‌كات. ئاخر ئێمه‌ چیمان كردبوو گوناحمان چی بوو وا به‌و ده‌رده‌یان بردین. ئیتر به‌ سه‌رگه‌ردانی‌و ته‌نها به‌ جله‌كانی به‌رمانه‌وه‌ هه‌ریه‌كه‌ كه‌وتینه‌ ڕێ به‌لایه‌كا. حكومه‌ت وتبووی ئه‌وه‌ی بچێت بۆ بنه‌سلآوا[٦٥] له‌ هه‌ولێر.

---

[٦٥] - بنه‌سلآوا ده‌كه‌وێته‌ ٧كم رۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ندی شاری هه‌ولێر، له‌ نیوه‌ی دووه‌می هه‌شتاكان وه‌ك ئۆردوگایه‌ك دروستكرا بۆ نیشته‌جێكردنی راگوێزراوانی گونده‌كانی ده‌وروبه‌ری كه‌ركوك و به‌شێك له‌ ئه‌و كوردانه‌ی ناو پارێزگای كه‌ركوكیش راگوێزران و له‌م ئۆردوگایه‌ نیشته‌جێكران. له‌ نه‌وه‌ته‌كان حكومه‌تی هه‌رێمی كوردستان كردی به‌ ناوه‌ندی قه‌زا، له‌ رووی ئیدارییه‌وه‌ سه‌ر به‌ پارێزگای هه‌ولێره‌و ئێستا زیاتر له‌ دووسه‌ت هه‌زار كه‌سی تیادا ده‌ژین.

یان بۆ مەدینە شۆڕش[٦٦] لە چەمچەماڵ تەعویزی ئەدرێتێو زەوی دەدەنێ بیکاتە خانوو. هەبوو چوون بەرەو هەولێرو هەندێکیش چوون بۆ ئۆردوگای شۆڕش لە چەمچەماڵ، ئەوانەی ڕۆیشتن بۆ ئەو ئۆردوگایانە لەوێ نیشتەجێ بوو بوون شوکر بۆ خوا ئەوان بەر ئەنفال نەکەوتن. بەڵام بۆ نەگبەتی ئەوانەی چوبوونە شۆڕش شەوێ پێشمەرگە دابوییە سەریانا خێوەت و کەلوپەلەکانیان سوتاندبوو[٦٧]. پێشمەرگە حەزیان نەئەکرد خەڵکەکە بڕۆنە شارەوە، ئێ ناهەقیشیان نەبوو چونکە ئەو خەڵکە نان و ئاویانی ئەدا، ئەگەر خەڵکەکە نەمایا و هەمووی بچوایەتە شارەوە ئەوانیش نەیان ئەتوانی لەو دەشت و دەرە بژین، بزانە کە ئەنفالەکە بوو دێهات نەما ئەوانیش هەموو نەچوونە ئێرانەوە. ئەوانەی لای ئێمە، هەیش بوو چوونە کەرکوک بۆ ماڵە خزمو کەسوکار، ئەوانەیش نەجاتیان بوو بوو. بەڵام هەموو ئەو خەڵکەی تر کە بەرەو بنارگل چوو، یان بەرەو قەرەحەسەن ناو جەباریو هەبوون بۆ دێیەکانی نزیک

---

٦٦ -شۆڕش لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٧ وەك ئۆردوگایەك بۆ نیشتەجێکردنی بەشێك لە راگوێزراوانی گوندەکانی سنوری کەرکوك و چەمچەماڵ دروستکرا، ساڵی ٢٠٠٠ کراوەتە ناوەندی یەکەی ئیداری (ناحییەی شۆڕش)و شەست هەزار کەسی تیا دەژێت.

٦٧ شەوی ١١ لەسەر ١٢ی مانگی ٧ ی ساڵی ١٩٨٧ هێزێکی هاوبەشی یەکێتیی کە پێکهاتبون لە تیپەکانی ٥٧ و٥٩ و مەفرەزەیەکی مەکتەبی عەسکەری سەر بە مەڵبەندی یەکی سلێمانی و لەگەڵ مەفرەزەیەکی (پاسۆك) پەلاماری ئۆردوگای شۆڕش و رەبیەکانی دەوروبەریاندا کە تازە دروستکرابوو.

خۆمان‌و هەتا قادرکەرەمیش.[68] دوای ئەوەی ساڵ هەڵگەڕایەوە، ئائا هەر ساڵ‌و شتێ، مانگێ ئەگەر دووان ئەبوو لەو ئاواییانە بووین هەمووی بەر ئەنفالەکە کەوت‌و تیاچووین. ئەوانەی فیراریان هەبوو یان لە خۆیان ئەترسان یا مەڕداربوون دەبوو بچنە شوێنێ دوورە دەست کە حکومەت دەستی پێیان نەگات. ئێ ئەوکاتە خەڵك دێیەکان تریش هەمووی جێوڕێی ئەوەنە نەبوو هەر بەش خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی‌و ئاژەڵەکانی بوو. بۆیە زەحمەتیش بوو هەمومان پێکەوە بچینە دێیەك یان ناوچەیەکی تر، پەرتەوازە بووین‌و ئەوەی ناسیاوێکی لە گوندێکی تر هەبووایا پەنای بۆ ئەو ئەبرد، ئیتر هەر یەکی کەوتینە شوێنێکەوە. چونکە نەك هەر خۆمان دەبوو جێی مەڕو ماڵاتەکەیشمان بکەنەوە. گیان بەوە بوو کە لێمان قەومیا سەرەتای بەهار بوو، هەروا تازە نەورۆزمان کردبوو مامشەیان رمیان. بۆیە هەتا چەند مانگێکیش مەڕوماڵاتەکانمان ئالیك‌و خواردنیان پێویست نەبوو هەر لە دەشت‌و دەر تێر دەبوون، ئەگینا کەس نەبوو لە دێیەکانی تر بتوانێ ماڵێ بگرێتە خۆی، بەچی ئالیك‌و خواردنی ئەو هەموو مەڕوماڵاتانە پەیا ئەکرا.

ئێمە ماڵ خۆمان‌و حاجی ئەحمەد غەزورم پەنایەکمان شك دەبرد، چونکە ماڵ باوکم لە سۆران بوون‌و حکومەت نەچووبوونە ئەو ناوچەیە، پێش ماوەیەکیش بورهان شوبرام لە مامشەوە چووبووە ئەوێ‌و بنەیەکی

---

[68] -قادرکەرەم ناوەندی یەکەی ئیداری ناحییەی قادرکەرەمە، ٦٠کم دەکەوێتە باشوری رۆژهەڵاتی چەمچەماڵەوە.

**دانابوو، چونکە مامۆستای شۆڕش[٦٩] بوو لە مامشە لە خۆی ئەترسا ئەو زووتر پێش دێ ڕمیانەکە ڕۆیشتبووە سۆران‌و لەوێ نیشتەجێ بوو. بۆیە ئێمەیش بەهۆی ماڵ باوکم‌و بەهۆی بورهانیشەوە ڕۆیشتینە سۆران‌و لە ماڵ باوکم جێی خۆمان‌و ئاژەڵەکانمانیان کردەوە.**

**تۆ ئەوە بێنە پێشچاو خۆت پانزە بیست ساڵ بێت دراوسێ‌و یەك ماڵ بیت لەگەڵ کۆمەڵێ خەڵکداو لەپڕ لەیەك جیا ببنەوەو نەزانی ئەوان ئەکەونە کوێوە، ماڵ‌و هەواڵێکیان نەزانی. بۆ من شانزە حەڤدە ساڵ بوو، ئەوانەی تری ئاوایی پشتیان پێکەوە بڕابوویەوە. هەموو عومرت لەگەڵ ئەو خەڵکە بیت‌و ئیتر یەك نەبیننەوە، چی عەزابێکە. بەڵام هێشتا بۆ ئێمە باشتر بوو لە مناڵەکان، ئەوان گوناح بوون لە دێکەی خۆمان ئەوانەی قلێ هەراش بوون بەلای کارو بەرخەوە بوون لەگەڵ مناڵ ماڵە هاوسێ شەوو ڕۆژ پێکەوە بوون، لە کۆڵان پێکەوە یارییان ئەکرد، کە لەیەك دابڕابوون ئیتر هەر داوای هاوڕێکانیان ئەکرد، یان ئەیانووت لەکوێیە؟ بۆ ئەو نەهاتووە بۆ ئێرە؟ ئەی بۆ ئێمە لەگەڵ ئەوان نەچووین بۆ هاتین بۆ ئێرە؟ یان داوایان ئەکرد ئەبێ بیانبەین بۆ لایان. شەو هەبووە تا خەوتوون بەدەم هەنسك‌و گریانی مناڵەکانەوە**

---

[٦٩] - حکومەتی عیراق لە بەشێك لەو گوندانەی کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەوە، پرۆسەی خوێندنی ڕاگرت. شۆڕش بڕیاریدا دەرگای ئەو قوتابخانانە بەڕووی قوتابییانی گوندەکاندا بکاتەوەو ئەوانەی وانەیان بە مناڵان دەوتەوە بە ناوی مامۆستای شۆڕش ناو دەبران، بەڵام مەرج نەبوو مامۆستابن، ئەمانەش بەشێکیان ئەو گەنجانە بوون کە لە سەربازی هەڵهاتبوون و لە گوندەکان نیشتەجێ بون.

منیش وەعدم پێداون شەو بخەونو بەیانی ئەچین بۆ لایان. بەیانیو دەیان شەومان بەم جۆرە بردۆتەسەر. ئەوە ئەوکاتەی مامشەیان روخانو هاتبووینە سۆران ماوەیەك سالْحو ئارام ستاریان لێمان بڕی بوو، هاوینی پێشوو کە دۆینەمان لە سەربانەکان هەڵخستبوو باوکی لە کەرکوك لە چویپ تایەی پاسکیل دارلاستیکێکی بۆ سالْح دروستکردبوو بە دیار دۆینەکەوە دایناوبوو راوی چۆلەکە بکات، چونکە دۆینەکەیان ئەخواردو جیقنیەشیان ئەکردە سەریا ئەبوو هەتا چەند رۆژێك لە چۆلەکە پاسی بکەیت. لەو هەموو ماڵو موڵکەی ئاوایی سالْح کوڕم ورکی گرتبوو لە دارلاستیکەکەیو ئەیووت من ئەمەوێتەوە، ئێ هەر نەمانئەزانی کەوتە ژێر خانووە روخاوەکانەوە، لەگەڵ ماڵەکەیا سوتانبوویان، کوڕەکە ئەوانەی نەئەزانی بەم رۆژگارە بۆی ئەگریا. ئارامیش ئەوی بەو جۆرە ئەبینی ئەویش ئەیکردە زیڕوزاو هەنێ تەلو تەتکەوپەتکەی هەبوو.باوکی بە (سیفۆن) سەرە کۆلای رەنگاوڕەنگ بە تەل وەك سەیارە بۆی دروستکردبوو، ئەو رۆژەی دێکەیان رمیان ئەویش هەر کەوتبووە ژێر دارو بەردی خانوەکانەوە، هەر بیریان ناچووەو یەخەمیان ئەگرد ئەبێ بچم بۆیان بێنمەوە. ئیتر منالْ بوونو لەدارەی دنیایا هەر ئەوەیان هەبوو خۆشیانئەویست، بەخوا لە سجنەکەیش بوین لە دوبز سالْح هەر بیری نەچوو بوەوە ئەیووت ئەگەر لە مامشە دارلاستیکەکەمتان بهێنایا من بەردم لەو عەسکەرانە ئەدا وا ئەو شەوە بردمانیان.

ئێستا خەڵك كە باس ئەنفالو دێ رمیان ئەكات وا ئەزانێ خەمو مەراقەكەی هەر ئەو ئازیزانەمانن كە لە ئەنفالدا تیاچوون. ئێمە پێش ئەوەی ئەنفالەكەمان بەسەردابێت بەسەرهاتەكانمان رۆیی، یادگارییەكانمان رۆیی، كەسوكارو دۆستو خۆشەویستەكانمان لەیەك دابڕیاینو ئیتر یەكتریمان نەبینییەوە، یان لە ئەنفال لە زیندان چاومان بەیەك كەوتەوە، هەبوو لە ئەنفالەكەیش هەر یەكمان نەبینی، یاخوا هیچ قەومێ وەك ئێمەی بەسەردا نەیات تازە مەگەر لە قیامەت یەكتر ببینینەوە.

لە سۆران بووین بۆ من تاڕادەیەك یادگاریم لەوێ هەبوو، كەسوكارم لەوێ بوون. لەوێ لە دایكبوو بووم تا تەمەنم گەیشتە پانزە ساڵی لەوێ ژیابووم، بەڵام وەرە یەكێتر بێنە هەموو تەمەنی لە مامشە بووە، ئێستا بە دەروەدەری چووبێتە گوندێكی تر لە چاوە خانوویەكا جێیان كردبێتەوە، نەبوو، نەدارا، كەسێ نەناسێ ئەبێ چەنێ زەحمەت بێ بۆی. ئاخر ئەگەر لەجێوڕێی خۆت بیتو لەگەڵ دەروردراوسێو ناسیاوی خۆت بیت، پێویستیەكیشت هەبێ بە ماڵە هاوسێكەیا رائەبینی ئەدەی لە دەرگاكە ئە چوار هێلكەم بەنێ میوانێ ناوەختمان هاتووە، یان كەلە شەكرێ، چۆڕە نەوتێ، كورە شقارتەیە، هەر پێویستییەكت هەبوایا پەنات بۆ ماڵە هاوسێیەك دەبرد. دەیانجار كە میوان هاتووە شتمان كەم بووە كوورە هەتا پێخەفیش، بە هاوسێو خزمەكانمانا رابینیووەو چووین لەماڵان هێناومانە. بەڵام بە دەربەدەریی روو بكەیتە ئاواییەك

نەدیوو نەناس، شتێکیشت پێویست بێ لەڕووت نایا بچیتە بەر قاپی کەس، ئەهل ئەو ئاواییەی ئێمە بە جلەکانی بەر خۆمانەوە چووبووینە سەر دێیەکانی تر، نە زەخیرەی پاشەکەوتمان بوو، تەنانەت بەروبوومی ئەو ساڵەشمان بۆ کۆنەکرایەوە تا هیچ نەبێ هەتا ساڵ هەڵئەگەڕێتەوە ئیحتیاجی کەس نەبووینایا. ئینجا منالّ هەبوون‌و نەبوونیش نازانێ، بۆن خواردنێکی بکردایا لە کۆڵان یان لە ماڵە هاوسێیەکەوە بۆنی چێشتێ بهاتایا، ئەهاتەوە داوای ئەکرد، بەخوا من لەسەرووی ئەو حاڵەی خۆمەوە ڕۆژ تا ئێوارە خەفەتم بۆ خەڵکەکەی تری (مامشە) دەخوارد، ئەمووت دەبێ کەوتبێتنە کوێوە، چیان بەسەر هاتبێ؟ من چونکە مامانیم دەکرد تێکەڵ هەموو ژنانی ئاوایی بووم هەمووی وەك کەسی خۆم وابوون. تەبیعەت هەموویان شارەزا بووم، ژن هەبوو لە ئاوایی ئەوەنە شەرمن بوو ئەوەنە بە حەیابوو زەلامێ دراوسێ لە ماڵدا بوایا یان بە سەربانەوە بوایا، لە ڕووی نەدەهات لە ماڵەکەی خۆی سەرکاتە دەشتەوە. ئەی ئێستا ئەبێ بە غەریبی کەوتبێتە ماڵی چی نەناسێکەوەو دەبێ چۆن بژی. چۆن سەرئاو بکات، چۆن بچێتە سەرشۆرکێ. کورە بە خوا خەڵك لادێکان ئەوەنە فەقیر بوون ئەوەنە سەلار بوون لە بنیادەم ئەم زەمانەیان ناکرد. بەخوا هەبوو لەو بن دەست کەرکوکەوە بووین مەگەر بە نەخۆشیو بۆ دکتۆر بردبێتیانە کەرکوك ئەگینا شاری نەبینیبوو، وەرە ئێستا ماڵی وێران بووەو ناچارە

مل بنێته شارەوەو لەوێ بژی. دێرمیانەکە بەقەدەر ئەنفالەکە مەینەتی بوو بۆمان بەڵام کەس هەستمان پێناکات.

ئێمە جێوڕێمان باش بوو لە ماڵێ باوکم، کوڕێ شوبرام ناوی لوقمانە تەلەبە بوو پێشتر لە کەرکوك ئەیخوێنا، ئەو نەهاتبوو لەگەڵمان‌و بەهۆی ئەویشەوە خەسوم چوو بووە کەرکوك‌و بووە بناوانی ئەو، زۆر قەرەباڵغ نەبووین. بەڵام خێزان وابووی شەش حەوت هەر کچە عازەویان بووی، شەش حەوت زەلامیان بووی، منالێ ویردەیان بووی، ئەوانە گوناح بوون وا لە ماڵێکا چاوە خانوویەکیان دابوو پێیان ئەم رەوە خێزانە لەکوێ جێی دەبووەوە. کە هاتبووین تەنها بە جل‌و بەرگەکەی بەرمانەوە بووین، نە زەخیرەیە نە رزقێ نە شتێکمان پێبوو، وا رۆژێ دوان خەڵك داڵدەی دایت ئەی دوای ئەوە. بۆیە ئەو ماوەیە کە مامشە رمیا هەتا ئەنفالەکە، بۆ ئەو ماڵانەی رووپانکردبووە گوندەکانی ترو نەچووبیوونە شارەوە هەموو رۆژێ مردنێ بوو ئەوەنە لە نەهامەتییا بووین.

خەزورم‌و ئێمەو منالەکان خۆمان‌و ماڵێ بورهان تا ئەو رۆژەی دەستگیر کراین لە ئەنفالەکە لەوێ ماینەوە. ساڵێك‌و مانگێ ئەبوو ئێمە لە سۆران بووین ئەوجا ئەنفال روویدا. ئەو ماوەیە لە جێش‌و جاش رزگارمان بوو چونکە سۆران دویر بوو لە حکومەتەوەو ناوچەی پێشمەرگە بوو. بەڵام بەقەدەر ئەوەی کە لە مەترسی حکومەت پاراستبوومانیان، پێشمەرگەکان خۆیان ئەوەنە بوویوونە ئەرك بەسەرمانەوە، خەڵك خۆی نەبووبوو دەبوو هەموو رۆژێ نانی پێشمەرگەیش بدەین. بە میوانی

دەهاتن‌و لەماڵ دەمانەوە دەبوو نانیان بۆ بکەین‌و بۆ خەوتن لێفەی خۆمان‌و مناڵەکانیان بەسەردا بدەین، ئێ ئەوکات وەك ئێستا نەبوو خەڵك کەلوپەلی زیادەی نەبوو، ئێمەیش ئەوەی هەمان بوو لە مامشە هەمووی لە ناوچوو، لێرە وەك ئەوە وابوو تازەماڵ بین‌و تازە خەریك بووین ماڵمان پێکەوە دەنایەوە. کە لەماڵەکانیش نەمانایەتەوە ئەچوونە مزگەوت یان هەموویان لە ماڵێکا ئەخەوتن دەبوو دۆشەك‌و لێفەیان بدەینێ تا لەوێ پێی بخەون‌و سەرمایان نەبێت، وەك مناڵ خۆمان بەخێومان کردن، نەمانزانی دوای ئەوەنە بێوەفا دەرئەچن لەگەڵمانا، ئێستا ئیشێکت پێیان بکەوێ هەر ئەڵێی ئەو زەلامەی ئەوسا نین، ناتناسنەوە.

لەبەرئەوەی هەموو رۆژێ پێشمەرگە ئەهاتنە ئاوایی، بەهۆی ئەوانیشەوە هەواڵی شوێنەکان ترمان ئەزانی. لە هەر شوێنێ تەقەیە بوایا ئەوان جیهازو شتیان هەبوو یەکتریان ئاگادار ئەکردەوەو ئەیانزانی، خەڵکەکەیش لەوانەوە ئاگادار ئەبووین ئەگەر هەر شتێ بوایا. ماوەیەك باش بوو شەڕو شۆڕ لە مەنتیقەکەی ئێمە دور کەوتبووەوە. بەڵام زۆری نەخایاند قسەوباس بڵاوبوویەوە کە حکومەت جەیشی بردووە بۆ ئەو ژویرە بۆ سەرکردایەتی پێشمەرگە[70]. ئەو ماوەیە پێشمەرگەکانی لای ئێمەیش هەمویان رۆیشتبوون ماوەیەکی زۆریان پێچوو هەتا گەڕانەوە. بەڵام کە هاتنەوە هەموو شەکەت‌و هیلاك، چڵکن ریش هاتوو. لەگەڵ

---

[70] - پەلامارەکانی ئەنفال بۆ سەر سەرکردایەتی ی،ن،ك لە شوباتی ١٩٨٨

هاتنەوەی ئەواندا ئیتر ترس‌و دڵەڕاوکێ دروستبووەوە چونکە خەڵکەکە لە دەمی ئەوانیان بیستبوو کە جەیش‌و جاش چی بەو مەنتیقانە کردووەو ئەمجارە نەك هەر دێیەکانی روخاندووە ژن‌و منداڵ‌و هەرچی کەوتبێتە بەردەست جەیشەکە بردوویەتی، ئەیانوت کیمیایی تەقاندووە خەڵك هەمووی بەیەکەوە هەر بە پێوە رۆیشتوون‌و مردوون، مەڕومالات هەمووی مرداربوونەتەوە، تەیرو تور بەو ئاسمانەوە کەوتوونەتە خوارەو مردار بوونەتەوە. ئیتر ترسێك لەناو ئەو خەڵکە دروستبوو ئەتووت چاوەڕێی رۆژی قیامەتین.

کەس بەتەمای روح خۆی نەما، رۆژە رەشێك بوو نەئەپەرژایتە سەر ئەوەی خەم لە کەسی تر بخۆیت، هەموو هەر هەڵپەی بوو چۆن دەستی ماڵ‌و منداڵی خۆی بگرێت‌و بەلایەکا رابکات. پێشتر لادێ وانەبوو کێشەیە شتێ هەبوایا هەمووی پێکەوە تەگبیریان ئەکرد چی بکەن، یان دوو ریش سپی ئاوایی لەباتی هەموو خەڵکەکە ئەیانووت وا دەکەین، ئێمە چەند جار لە مامشە کە مەترسی هەبوو چوار زەلام دائەنیشتن‌و ئەیانووت ئەمشەو هەموو دێیەکە چۆڵی ئەکەین، ئیتر هەموو خەڵکەکە دوای قسەی ئەوان ئەکەوتن. بەڵام ئەمجارە کەس هەقی بەسەر کەسەوە نەبوو. هەر یەکێکت دەبینی لێت ئەپرسی بە نیازی چین، چی بیکەین، چۆن خۆمان بپارێزین؟ ئەیووت وەڵا کەس نازانێ چی ئەبێ‌و چۆن ئەبێ، هەرکەس تەگبیری حاڵی خۆی بکات. ماڵێ هەبوو ئەیانووت ئێمە بەنیازین رێگەیە بدۆزینەوە بچینە قادرکەرەم، هەبوو .ئەیووت خزمم لە

چەمچەماڵەو دەمانەوێ بچینە ئەوێ، هەبوو بەنیاز بوو بۆ ناو ئاواییەکانی ناو زەنگنەو ناوچەی سەنگاو بچێت. دە دوانزە رۆژێ ئەم واتەواتو ترسە هەر بەردەوام بوو هەتا وتیان ئەوە لە گەرمیانو لە کەرکوكو چەمچەماڵو دوزەوە جەیش کۆبۆتەوەو دەوری هەموو ناوچەکەیان گرتووەو خەڵکەکە هەمووی ئەگرن. ئیتر بە تەواوی سەغڵەت بویمان هیچ چارەیەکمان نەبوو قاپی خوا نەبێت. هەر ئەپاڕاینەوە خوایە دەرگای رەحمت بکەیتەوەو بگەیتە فریامان.

هەندێ مستەشار[٧١] و جاش هەبوون خەڵك گوندەکان لای خۆمان بوون، ئەوان خەڵکیان ناردبوو بۆ گوندەکانو هەواڵیان لەناو خەڵکەکە بڵاوکردەوە کە مشورتان ئەخۆین. حکومەت قەراری داوە لادێکان نایەڵێتو هەمووی دەباتە موجەمەع لەوێ زەوی‌و خانوتان دەداتێو تەعویز وەردەگرنو ئەوەیشی فیراربێ لای خۆمان ناونویسیان ئەکەین یان خۆی تەسلیم بکاتەوە لە رێوە تەسریح ئەبێو نایکەنەوە عەسکەر. وەڵا لە راستیا بەم قسانە تۆزێ فەریحی کەوتە دڵمانەوەو ئەمانووت ئیشەڵا ئیتر نەجاتمان ئەبێ، هەرچەندە ژیان لە شار وەك سجن وایە،

---

[٧١] -مستەشار، بەو سەرۆك جاشانە ووتراوە کە لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەم لەلایەن حکومەتی عیراقییەوە یەکەیەکی تایبەتی چەکداری دروستکرد بەناوی (فەوجی خەفیفە). لە هەر عەشیرەتێکیشدا زیاتر لە فەوجێکی پێدەدان بۆ ئەوەی گەنجەکانیان لەریزەکانی ئەو فەوجانە تۆمار بکەن. ئامانجی سەرکیشی بۆ ئەوەبوو کۆمەڵگەی کوردی بۆ کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی بگەڕێنێتەوە، هەروەها لە چەند قۆناغێکیشدا دژ بە پێشمەرگە بەکاری بردوون و لە پرۆسەی ئەنفالیشدا بەشدارییان پێکراوە بۆ دەستگیرکردنی هاوڵاتیان کورد.

بەڵام هەرچۆنێك بێت لەم دڵەڕاوكێیە باشترە نەزانیت تا بەیانی چیت بەسەردێ‌و ترسی ئەوەیشت هەبێ ئەم دەرمانە كیمیایی بكاتە بانمانا.

پێشتر ئەوەنە رقمان لەو قەوم‌و قیلەیە بوو كە بوو بوونە جاش‌و پیاو حكومەت بوون فەوجیان وەرگرتبوو[٧٢]، بە ئێمە بوایا پێشمەرگە هەموویانی بكوشتایا. بەڵام كە ئەم قسانەمان ئەبیست ئەمانووت بەس نەبوو ئەم خزمە چەكدارانەیش هەن هەر چۆنێك بێت هاوزمان خۆتن‌و خەڵك ناوچەكەن‌و لە یەك عەشیرەتین خوێنمان یەكە، ئەوەتا لە تەنگانەیا بەكەڵكمان دێن.

رۆژانە دەنگ هەلیكۆپتەر ئەهات گوێمان لە زرمەو ناڵەی تۆپ دەبوو، تەواو دڵنیابووین حكومەت نیەتی خراپە. ئیتر بە دەست خۆت نییە لە رۆژی وایا هەر خەم رۆحی خۆتتە، لە دڵی خۆما ئەمووت خۆزگە كە مامشە رمیا ئێمەش وەك خەسوم بچوینایەتە كەركوك، یان وەك ئەو ماڵانەی تر كە چوونە (بنەسڵاوەو شۆڕش) رەنگە بكەوتینایەتە فەریحییەوە. خۆ محەمەد مێردم ئەوكاتە نە فیرار بوو نە هیچی لە هیچا بوو لە دایەرەی ئیشغاڵیش بوو لە كەركوك نازانم بۆ وا خۆمان سەرگەردان كرد، هەر لەخۆمانەوە لەوە ئەترساین روو بكەینە شارو ئەمانووت برایەكی مامۆستای شۆڕش بووەو بەهۆی ئەوەوە ئێمە دەگرن. ئێمەیش دوای قسەی ئەو خەڵكەی تر كەوتین كە وتیان ناچینە شارەوەو ئەچینە ئاواییەكانی تر بزانین خوا چی دەكات. دوای

---

[٧٢] - عەشیرەتی جەباری ٣ فەوجیان هەبووە، سەید تایر، سەید عەدنان، حەسیب حەمە ئینجە.

مەڕومالآت کەوتین بۆیە وامان بەسەرهات. پەشیمان بووم لەوەی لە مامشە بە باوك منالەکانم دەووت بچینە مالّ باوکم ئەوان لە سۆران جێوڕێیان زۆرە، ئەمووت یان ئەگەر ئەمان مالّیان لە سۆران نەبوایاو ئێرەمان شك نەبردایا رەنگە بچوینایەتە دێیەکی تر حکومەت ئیتر بەدوامان نەکەوتایا. دوایی کە گیراین‌و براینە (تۆپزاوا) لەویّ زانیمان خەلّك هەموو لادێکان کوردستان هەمووی قوڕکریاوە بەسەریاناو لەویّ کۆکرابوونەوە.

زەلامەکان ئاوایی لە سۆران زۆربەیان کە ناویان هاتبووەوە بۆ عەسکەری هەر نەچووبوونە پێشەوە، لەبەرئەوەی شەڕی ئێران‌و عێراق بوو خەلّك نەیدەویست منالّی بۆ سەدام بە کوشت بدات بۆیە ناچوون بۆ عەسکەری‌و هەر لە دێیەکان دەمانەوە، ئەمانە فیرار نەبوون شتیّ تریان پێیانئەووت وابزانم (موتەخەلیف) بوو شتیّ ئاوا بوو. ئەوانەی کە دەبوونە عەسکەرو ماوەیەك دەوامیان ئەکردو دوای رایانئەکرد بەوانەیان ئەوت (فیرار). هەر کاتێکیش ترسیّ شتیّ هەبوایا بیانووتایا حکومەت دەچێتە ئەو ناوچەیە زەلامەکان بەتایبەت ئەوەی فیرار بوو یان نەچوو بوو بۆ عەسکەری، شەو دەچوونە ئەو دەشت‌و دەرە لەناو کەلّوەزو ئەو شوێنانەی لە ترسی تەیارە دروستیانکردبوو خۆیان حەشارئەدا هەتا بەیانی دوای خۆر کەوتن‌و نزیکەو چێشتەنگاو ئەهاتنەوە. چونکە حکومەت عادەتی وابوو لە دەمەوبەیانی زوو جەیش‌و جاشی دەنارده سەر دێیەکان، خەلّك لە خەودابوون کە خەبەریان دەبووەوە دەوری

دێیەکەیان گیراوە. بەهۆی جاشەکانەوە هەر جارێ دەرچوونیان هەبوایا بۆ هەر دێیەك جاشەکان زوتر ئەیانزانیو لەوانەوە ئەبیسترا کە بەیانی دەرئەچن، بۆیە ئەو کاتانەی کە مەترسی یان زانیاریی هەبوایا جەیش دەچێتە هەر ناوچەیە ئیتر شەوان پیاوەکان لە ئاوایی نەدەمانو بەیانی کە رۆژ ئەبوەوە ئەگەر جەیش نەهاتایا دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان، جێشیش بهاتایا دەیانزانیو کە جەیشەکە دەڕۆیی دوای ئەوە ژنێ منالێ لە ئاواییەوە ئەچووە شوێنیانداو ئەوانیش دەگەڕانەوە.

سۆران لەبەرئەوەی چەند ساڵێك بوو حکومەت نەهاتبووە سەری خەڵك ئەو مەترسییەی نەبوو، بەڵام ئەم چەند رۆژەی جەیش دەوری ناوچەکەی گرتبوو ئەو قسەوباسانەیش هەبوون کە خەڵك دەگرنو دەیبەن، ئیتر لەوێش هەموو شەو زەلامەکان هەریەکی لێفە شڕەیەکیان ئەبردو هەندێ نانو مەتارەیە ئاو بووایە ئەگەر دۆ بووایە دەڕۆیشتنە هەردەکان. سەرەتای بەهاریش بوو تازە نەورۆزمان تێپەڕاندبوو بە شەوان هێشتا دنیا ساردبوو، بەڵام ترسەکەیش زۆر بوو لە ناچارییا دەبوو وابکەن. هیچ چارەیەکی ترمان نەبوو، نەماندەزانی چی بکەین تەنها خوامان شك دەبردو پەنامان بۆ ئەو هێنابوو. بە هەموو دێیەکە یەك سەیارەیەکی تیابوو شۆفرلێتێ سویر بوو هی ساڵەح برام بوو، سەرەتای قسەو باسەکان کە مەترسییەکە دروستبوو ئەو بەنیاز بوو بە چەند کاروانێ هەندێ لە ژنو منالەکان بەرێت بۆ قادرکەرەم، رۆژێك رۆیشتن لە رێگە کۆپتەر بووبوویە تویشیانەوە بە هیلاکەت خۆیان

کردبووه ناو هەنێ چەم‌و دارەوەو کۆپتەرەکە دای لە سەیارەکە شکانی.
یەك دوو ڕۆژێ هەر خەریکی بوو هەتا بە پارچە پارچە نایە یەکەوەو پێش ئەوەی بمانگرن ئەو چوو بۆ گوندی (کۆرمۆر)[73] بەشوێن ماڵ خوشکە گەورەکەما بیانهێنێتە لای خۆمان. ئیتر هیچ شتێ نەبوو تا ئەگەر بشتەوێ بەلایەکا بڕۆیت خۆتی پێ ڕزگار بکەیت. تەرەکتەرێکی تر هەبوو ئەویش هی ماڵێك بوو ناوی نەجات بوو، وا ئەگەر بەلایەکیشا چوون‌و هەر جێی دوو سێ ماڵێکی تیا ئەبوەوە. ئێ ئاواییەکە بیست ماڵ زیاتر بوون[74] هەر ماڵێك کۆشێ خێزان بوو. هەرچەندە ئەیانووت ڕێگاوبانەکان گشتی گیراون‌و ڕێی دەربازبوون نەماوە، بەڵام ڕێگەش هەبوایا هەر نەمانئەتوانی بڕۆین ئەو هەموو خەڵکە بەچی بڕوات، یان بۆ کوێ بڕوات؟ تازە چووبوینە ناو مانگ ڕەمەزانیشەوە هەموو بەڕۆژوین‌و ئەمانووت تۆ بڵێی خوا بەزەیی بەم هەموو ڕۆژووانەیا نەیاتەوە. بۆیە ئەهل ئاوایی هەر تەگبیرەکەیان وابوو شەوان زەلامەکان بچنە هەڵەتەکان‌و ژن‌و منال لە ئاوایی بمێنینەوەو بزانین خوا چی دەکات.

---

[73] - کۆرمۆر گوندێکە ١٦ کم دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەلاتی ناوەندی ناحییەی قادرکەرەمەوە.

[74] - لەسەرەتای دیدارەکە و لە باسی سەردەمی منالی ناماژە بەوە دەکات گوندەکەیان ١٥ ماڵ بووە، بەڵام لێرەدا بە ٢٠ ماڵ ئەژماری دەکات. جیاوازی نێوان ئەو وادەیەش نزیك بە ٣٠ ساڵە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی گوندەکە لەو ماوەیەدا چەند ماڵێك زیادیکردووە.

دوو سێ ڕۆژێك پێش ئەوەی لێمان بقەومێ کابرایە خزممان هەبوو ناوی کاك عەبدولخالق بوو خەڵك (باوا)[٧٥] بووی ماڵیان چووی بوویە کەرکوك هاتبوو بە هاواریمانەوە ئەیووت جێش‌و جاش دنیا هاتوون‌و وەك ڕەشبگیر خەڵك ئەگرن کەس نازانێ بۆ کوێیان ئەبەن هاتووم بەشوێنتانا وەرن هەرچۆنێك بێت خۆمان ئەگەیەنینە لەیلان و لەوێوە ئەچین لەماڵ ئێمە بن هەتا بزانین وەزعەکە بە کوێ دەگات، خۆ ئەم جێش‌و جاشە هەتا سەر لێرە نابن، لای ئێمە خۆتان داڵدە بدەن کە حکومەت چاوی لەسەر ناوچەکە نەما ئەگەر حەزتان لێبوو وەرنەوە جێوڕێی خۆتان لە ئاواییو ئەگەر هەر نەیشیانهێشت ئەوە هەتا نانێکمان هەبوو ئەیکەینە دوو کەرتەوەو پێکەوە ئەیخۆین. زۆر هەوڵی لەگەڵماندا بەڵام بەقسەیمان نەکرد. حسابکە هەر بە زۆرەملێ دایکم‌و باوکم‌و خێزان‌و منداڵەکانی عەلی‌و خێزانەکەی نوری برام‌و دوو منداڵ وردی بوو لەگەڵ خۆی بردیانی، بەڵام نەمانزانی بەسەلامەتی گەیشتبوونە لەیلان‌و کەرکوك یان لە ڕێگە کەوتبوونە ناو ئەو جێش‌و جاشێلەوەو ئەوانیش وەك ئێمەیان بەسەرهاتبوو یان نا.

وابزانم دوو شەو ئەگەر سێ شەو بوو دوای ئەوە بەیانییەکی زوو چەند سەیارەیەك جاش خۆیان کردە ناو ئاواییا، ژن‌و منداڵ‌و ئەختیار ئاواییان بانگکردو وتیان بچن زەلامەکانتان بهێننەوە. ئەوان ئەیانزانی کە

---

٧٥ - باوا گوندێکە هاوسنوری گوندی مامشەیە لە نزیك شارۆچکەی لەیلان لە پارێزگای کەرکوك.

زەلامەكان بە شەوان دەچنە هەردەو هەڵەتەكان، وتيان حكومەت چەند ڕۆژێ عافواتی داوە ئەگەر لەو ماوەیە بچننەوە ئەوە تەسریح دەبن لە عەسكەری‌و لە موجەمەع خانوو كراوە دەتانبەنە ئەوێ، هەر كەسيش نەياتەوە ئيتر چارەنوسی ئەكەوێتە دەست ئەو هەليكۆپتەرانە لە كونە مشكيش بن ئەياندۆزنەوەو ئەيانكوژن. بچن بە شوێنياناو بيانهێننەوە. جاشەكان جەماعەت (حەسيب) بوون[٧٦]. حەسيب خەڵك (مەحموپەريزا)[٧٧] بوو دێيەكان ناوچەی خۆمان. گشت يەكترمان ئەناسی، برايەكی حەسيب خۆی هاتبوو لەگەڵ جاشەكان‌و ئيتر متمانەمان پێيانكردو مناڵەيلمان نارد بەشوێن زەلامەكانا. سەعاتێ كەمتری پێچوو زەلامەكان هاتنەوەو هەريەكێ تفەنگێ بەشانيانەوە، ئەوكاتە خەڵك لە لادێ لە ماڵەوە چەكی خۆی هەبوو، پرياسكەيە نانيان بردبوو تا پارشێوی پێبكەن‌و لێفە شرەيەكيان پێبوو. تفەنگەكانيان تەسليم جاشەكان كردو وابزانم ناويانيان نوسيبوو هەركەسەو نارديانيانەوە ماڵەكەی خۆی. جاشەكان هەر جرت‌و فرتيان بوو ئەهاتن‌و ئەڕۆيشتن. نەمانئەزانی چييە، ئەمانووت رەنگە ئەوان بە ڕۆژو نەبن‌و ئەزانن ئاوايی هەمووی بە ڕۆژوون‌و كەس لە ماڵدا خواردنی نەكردووە بۆيە نايانەوێ عەزێتمان بدەن تا خواردنيان بۆ دروستبكەين، ديارە ئەو

---

٧٦ - حەسيب محمد نەجم ناسراو بە حەسيب حەمە ئينجە، مستەشار.

٧٧ - محمود پەريزا گوندێكە لە ناوچەی جەباری دەكەوێتە باشوری خۆرئاوای شارۆچكەی تەكييەوە.

هاتووچۆیەیان بۆ ئەوەیە ئەچن بزانە لەکوێ نانی نیوەڕۆ دەخۆن‌و دێنەوە. چونکە دەبوو چاوەڕێ بکەین بزانین وەك خۆیان وتیان ئێوە هەموو کەسوکاری خۆمانن‌و چاودێریتان دەکەین تا ئەتانبەینە موجەمەع، بزانین چیمان لێئەکەن‌و کەی ئەمانبەن. دیاربوو حکومەت هەموو دێهاتەکان ئەڕوخێنێ‌و ئێمە پێشتر لە مامشە بەسەرمان هاتبوو. بۆیە باوەڕیشمان بە جاشەکان دەکرد کە دەیانووت دەتانبەنە شارو لە موجەمەع دەبێت بژین. چونکە زۆر جاری تر لادێکان روخێندرابوون حکومەت خەڵکەکەی ناگرت، مەگەر فیرار بوایا. ئێ ئەمانیش کە وتیان عافوات دروواوە بۆ فیرارەکان‌و تەسریح دەکرێن، ئیتر ترسێکی ئەوتۆمان نەما کە چاوەڕێی چارەنوسێکی لەوە خراپتربین کە ماڵەکانمان وێران دەکەن‌و دەمانبەنە موجەمەع، بەنسبەت خەڵکی لادێوە خۆی ئەوە خراپترین چارەنوس بوو بتبەن لە ئۆردوگا بژێیت. وتمان ئەگەر خوا بکات راست بکەن زەلامەکان نەگرن، خۆ قابیلە ژن‌و مناڵ ناگرن، ئەیشمانزانی ئەو خزم و کەسوکارەی تری مامشە کە چووبونە موجەمەعەوە زەوییان وەرگرتبوو هەنێ پارەیشیان دابوو پێیان تا کولبەیە بۆ خۆیان بکەن، وتمان ئیشەڵا ئێمەیش دەبەن بۆ لای ئەوان.

تا نزیك دوای نیوەڕۆ هەموو لە ماڵەکان هەر چاوەڕێ بووین‌و ئەیشترساین ئەمانووت پێشمەرگە خۆی نەکاتە ئاواییاو نەزانن جاشی لێیە، لە دێیەکە ببێتە شەڕیان، لە هەر لایەك بکوژرایا هەر کورد بوون. هەرچەندە پێشتر ئێمە پێمان ناخۆش نەبوو جاش بکوژرێت، بەڵام ئەو

ڕۆژە چونکە وامان ئەزانی بەڕاستی ئەو جاشانە بۆ پارێزگاری لە ئێمە هاتبوون، بۆیە پێمان ناخۆش بوو شتێکیان لێبێت.

هێشتا مابووی بۆ بانگ عەسر جاشەکان داوایانکرد خەڵکەکە هەمووی لە خوار ئاواییەوە کۆبێتەوە. ئیتر هەموو چوینە ئەوێو هەریەکە پریاسکەیە نانو قوتیلکە یان مەتارەیە ئاوو دۆو بوخچەیە جلوبەرگمان پێبوو، وتمان نەك بۆ فتار نەگەینە جێوڕێی خۆمان، ئەگەر لە رێیش بووین بۆ ئەوەی فتاری پێبکەینەوە. دەبەیە دۆو هەنێ کەرەو دوو کولێرەیشم دانا بۆ باوك منالّەکان وتم محەمەد نەك زەلامەکان پێکەوە فتار بکەن عەیبە هیچت پێنەبێ لەگەڵ خۆت ببە، کەچی بە قسەمی نەکرد نەیبرد وتی کورە سەعاتێ دوان تر دنیا بەرەو مەغریب بڕوات جاشەکان ناوێرن بمێننەوە ئەڕۆنو ئێمەیش دێینەوە لەماڵ فتار ئەکەینەوە.

بەڵام کە خەڵك ئاوایی هەمووی کۆبووینەوە دامانیانە پێش خۆیان بەرەو هەردەیەك نیم سەعاتێ دوور لە ئاواییو لە دێیەکانی بانگۆل، شێخ مەحمود، سۆرانو قۆچەلی، هەمووی لە نزیك جادەکە لەوێ کۆکراینەوە. هێشتا جێش نەهاتبوو هەر جاشەکان قەومو قیلەی خۆمان بوون ئێمەیان بردە ئەوێ. وتمان ئەی کەلوپەلو ماڵاتەکانمان چی لێئەکەن، وتیان بۆتان دەهێننو لە موجەمەع وەریدەگرنەوە. مەڕو مانگاو کارو بەرخمان هەمووی بەو دەشتەوە بوو، هێشتا رۆژ زۆری مابوو بێنەوە. چەند شوانو گاوانێکی ئاوایی لەگەڵ مانگاو رانەکان بوونو وتمان رەنگە

به شوان‌و گاوانەکانیان وتبێت مەڕو ماڵاتەکان بێنن بۆ کوێ، یان رەنگە یەکێ لەم خزمە چەکدارانە بکەوێتە تەکیان هەتا ئەیانگەیەننەوە لای خۆمان. بیرم ئەکردەوە باشە کە مامشە رمیا ئێمەو هەموو ئەو ماڵانەی تر کە نەچووینە ئۆردوگاوە مەڕدار بووین‌و ئەمانووت لەشار شوێنی مەڕوماڵاتەکانمان نابێتەوە، ئەی ئێستا کە لەناچاریدا ئەبێ بڕۆین بۆ موجەمەع، چی لەو هەموو مەڕو مانگایانە بکەین؟ ئەمووت با ئێمەیش ئیسراحەتێ بکەین وەلا ئەبێ قەناعەت بە باوک مناڵەکان بێنم هەمووی بفرۆشین.

ئەوەنەی پێنەچوو کە لەگەڵ ئەهل ئاواییەکان تر تێکەڵ کرابووین جێشێکی زۆر هاتن بە مدەڕاعەو دەبابەو کۆپتەرو ئیتر زراومانچوو وتمان شتێکان بەسەر دێنن. لە راستیا چونکە جاشەکان ناسیاو بوون لەوان ناترساین، بەڵام کە جەیش هات ئیتر تەواو ترساین‌و بووە زریك‌و زاوی منال‌و قیژوقاوی ژن، ئەو شیوو دۆڵە پڕ بوو لە قیژەو هاوار. هەنێ جاشی تریش لەگەڵ جێشەکەیا هاتن، زەلامەکان لە دوورەوە (حەسیب حەمە ئینجە)یان ناسییەوەو وتیان ئەوە مستەشارەکە خۆی هاتووە لەگەڵ جێشەکەو باوەڕمان وابوو خۆی بۆیە هاتووە نەك جێشەکە غەدر لە خزم‌و خوێشەکەی بکەن. بۆیە خۆی هاتووە تا بمانپارێزێت. چونکە ئەو ئاواییانەی لەو هەردە کۆکرابووینەوە هەر هەموومان خزم یەك بووین‌و هەموشمان هەر کەسی نزیکی حەسیب بووین. هەورومەڵایەکیش بوو وتمان ئیشەڵا ئەبێتە تۆفان بەڵکوو ئەم کۆپتەرو جەیشەمان لەکۆڵ

بێتەوەو بڕۆن، لەو کاتەیا کەمێك باران باری بەڵام بای ئەوە نەبوو لەتاو باران جێمان بێڵن.

هەر لەوێ هەرچی زەلام ئەو چوار پێنج ئاواییە بوو لە ئێمە جیاکرانەوەو لەولای ئێمەوە کۆمەڵکریان. ئینجا لەناو زەلامەکانیش جارێکیتر کەوتنەوە جیاکردنەوەیان ئەوەی زۆر بە تەمەن بوو لەوەکانی تر جیاکرانەوەو بەتەمەنەکانیان هاوردەوە تێکەڵ ژنو منداڵەکانیان کردەوە. زەلامەکانیش لەتاو جەرگو چارەنوسی خۆیان دەستیانکردە هاوارو نزا ئەتووت رۆژی حەشرە. بەڵام هێشتا عەسکەرییەکان هەر لە دوویرەوە وێستیاونو هەقیان بەسەر هیچەوە نییە، هەر جاشەکانن بەدەوروخولمانا دێنو ئەوان جیامانیان کردەوەو کۆمەڵێ سەیارەی زیل عەسکەری دوا بەتاڵ درێژ درێژ هاتن، ئەها ئەوەی پێیانئەوت ئیڤا. زەلامەکانیان بەڕیز وێستیانو یەکەیەکە سەریانیان خستە ناو ئەو زیلانەوە، هەر سەیارەیەکیش چاومان پێوەبوو دوو عەسکەر لەگەڵیان سەرکەوتن. تفەنگەکانیان بە قایشێ درێژ کردبووە ملیانو شۆڕیان کردبووەوە لەسەر سینگیان رووبانکردبووە زەلامەکانو توند بەدەستیانەوە گرتبوویان، دیار بوو بۆ ئەوەیان بوو کەس نەوێرێت رابکات لە دەستیان.

هەرچەندە هەمووی هەر ناسیاوو کەسوکار بوون بەڵام ئازاری دووا دیمەنو دووا دیداری براکانمو باوك منداڵەکان قەت لەبەرچاوم لاناچێ. محەمەد مێردمو بورهان برای ئەوەی وتم مامۆستای شۆڕش بوو لە

مامشەو ساڵێ زووتر هاتبووە سۆران، ئەوان پێشتر سوار زیلەکان بوون‌و لای دەرگای سەیارەکە، ئەو کاتەی خەریکبوو سەر ئەکەوتن ئاوڕیان بۆ لای ئێمە دایەوە، محەمەد جامانەکەی لە سەری کردبووەوە لوولی کردبوو بەدەستییەوە بوو روویکردە ئێمەو وەك خواحافیزی چەند جارێ جامەنەکەی راوەشاند. قاژە کەوتە جەرگمانەوەو منالێ کردیانە هات‌و هاوار داوای باوکیان ئەکرد. ئەو کاتەی ماڵمان لە مامشە بوو باوکیان ئەوەنە نەئەکەوتە ماڵ یان عەسکەر بوو یان ئەوکاتەی لە دایەرەی ئیشغاڵ بوو لە کەرکوك، هەموو رۆژ ئەڕۆیی بۆ دەوام، بەڵام ئەم ساڵ‌و یەك دوو مانگەی لە سۆران بووین چونکە هەر لە ماڵ بوو لەگەڵ منالەکان زۆر هۆگر یەکتریی بووبوون، بۆیە کە لە ئێمە جیاکراینەوە منالەکان هەر خەریکبوو بالبگرن بۆ لای باوکیان، ئارام‌و نەهرۆیش کە تازە تەواو پێی گرتبوو منالتر بوون ناترسان تەکانیان ئەدا راکەن بۆ لای باوکیان‌و ناچار پەلیانم توند گرتبوو تا لەخۆم دورنەکەونەوە. غازی‌و عەلی برام بەدوای یەکتریدا ئەوانیش سەرکەوتن‌و هەر چاویان لەسەر ئێمە بوو بە دەست خواحافیزییان لێمان ئەکرد. ژن‌و منالەکان عەلی‌و نوری لەگەڵ دایك‌و باوکم رۆیشتبوون، بەڵام براژنەکانم ژنەکەی غازی خۆی‌و رەوێ منالێ پێبوو، ژن‌و منالەکانی سالح براشم هەموومان پێکەوە بووین. بەڵام ماڵ حەمەومین برام ئەوان زویتر باریان کردبووە شارو لە کەرکوك بووون. نوری برایشم لەگەڵ رانە مەڕەکەیا بوو لەو دەشتە، کە ئێمەیان برد هیشتا زووی بوو نەهاتبووەوە ئاوایی، ئیتر

نەمانزانی چی بەسەر هات، چوو بووەوە بۆ ئاوایی، کەوتبووە دەست جێش‌و جاش، کۆپتەر بردی، هەتا عافواتەکەی نەداو نەهاتینەوە هیچ هەواڵێ ئەویشمان نازانی.

وەك وتم برا گەورەکەیشم ساڵەح ئەوەی وتم کۆپتەر دای لە سەیارەکەی، ئەو دوو رۆژێ پێشوتر چوو بۆ کۆرمۆر خوشکێکمان لەوێ بە شو درابوو، چوو بە هەواڵ ئەوانەوە تا ئەگەر بۆی بکرێت خۆی‌و منداڵەکانی بێنێتەوە لای خۆمان‌و ئەمانووت ئەگەر شتێکیش بێ با هەمووومان پێکەوەبین. سەلمەی خوشکم‌و مێردەکەی‌و حەوت منداڵیان بووی کاکەم ساڵح وتی ئەگەر بۆمکرا ئەیانهێنمەوە بۆ ئێرەو ئەگەر جاش‌و جەیشەکە رێگەیان نەدا هەر لەوێوە دەیانبەم بۆ چەمچەماڵ، داوای لە براکان ترم کرد ئەگەر پێش ئەوەی ئێمە بێینەوە ئێوە رۆیشتن ئەوە چاوتان بە ژن‌و منداڵەکانی منیشەوە بێت.

ئەو کاتەی لە هەردەکە خڕکراینەوە هیچ هەواڵی ئەوانمان نازانی‌و هەر چاومان بەرێوەبوو بەڵکوو خوا بکات بگەن پێمان‌و هەمووومان هەر پێکەوە بین، بەلام دەنگیان نەبوو ئیتر نەمانزانی هەر لە کۆرمۆر مابوونەوە یان وەك کاکەم وتی بردبوویانی بەرەو چەمچەماڵ، ئەمووت بەڵکو خوا بکات ئەوانیش بیریان لەوە کردبێتەوە بچنە لەیلان و لەوێوە بچن بۆ ماڵ ئەو خزمێلە لە کەرکوك و لەگەڵ دایکم‌و باوکم‌و منداڵەکان عەلی‌و نوری یەکبگرنەوە، هەرچۆنێك بێت ئەگەر هەموویشمان پێکەوە نەبین، دوو کۆمەڵ بین باشترە، یان بەشکە خوا بکات چووبێتە ماڵ

حەمەومین برام لە کەرکوك. ئیتر ئێمە هەواڵی ئەوانیشمان نەئەزانی ئایا لە رێگە دەستگیرکریان یان گەیشتبوونە شوێنێ کە سەلامەت بن، دوو سێ رۆژی پێچوو لە تۆپزاوا زانیمان ئەوان چیان بەسەرهاتووە، بەڵام هەواڵی دایکمو باوکمو ماڵ عەلیو منداڵەکان نوری برامان هەر نەزانی هەموو ئەو ماوەیە کە لە سجن بووین لەپاڵ ئەو رەزالەتەی خۆمانەوە خەفەت دنیام بۆیان خواردووە، بەڵام دوای شەش مانگ زانیمان ئەوان شوکر بەر ئەنفالەکە نەکەوتونو رزگاریان بووە.

لە بەیانی زووەوە فەرەیدون برای حەسیب مستەشار لە ئاواییەکە بوو، کە جەیشەکە هاتو ئیڤاکانیان هێنا بۆ ئەوەی زەلامەکانی پێبەرن لەو کاتەیا حەسیب ئینجە خۆیشی هاتبوو وێستیابوو بە بەرچاوی ئەوەوە سەریانیانخستو بردیانیان. ئیتر هەر لە دویرەوەو بەشەرمیشەوە بە ئیشاراتو دەست بەرزکردنەوە وەك سەڵاو خواحافیزییمان لە زەلامەکان کرد. ئاخر منداڵ وا هەبوو باوکی لە قاپی حەوشە ئەچووە دەرەوە بەدوایا ئەگیراو دوای ئەکەوت، وەرە ئێستا بەو شێوەیە پەلی بگرنو بیخەنە سەیارەوەو بە بەرچاوی ژنو منداڵەوە ئەبێ منداڵ چۆن هارو شێت نەبێ. بڕوابکە هاتوهاوارێك بوو مەگەر هەر ئەو خوایە خۆی بتوانێ بیگێڕێتەوە. ئەوانیان بردو ئێمەش بەزمان بەڕۆژو برسیو تینوو لەو هەردەیا شێنو رۆڕۆمانە. هەنێ لە عەسکەرەکان لەگەڵ ئەو زیلانە رۆیشتن کە زەلامەکانیان برد. بەڵام جاشەکان لەگەڵیان نەچوونو هەموویان لای ئێمەوە مانەوە، تەواو ترسمان لێنیشت بە جاشەکانمان

ئەوت بۆ کوێیان ئەبەن؟ هەر ئەیانووت ئەیانبەن هەفتەیەکیان پێئەچێ‌و تەسریحیان ئەکەن‌و دێنەوە بۆ لای ئێوە لە موجەمەع. وتمان ئەی بۆ ئێوە لەگەڵیان نەچوون، ئەیانووت ئێمە چۆن ئێوە لای ئەم عەسکەرانە جێدێڵین لەبەر ئێوە ماوینەتەوە. ماوەیەکی پێچوو حەسیب‌و هەنێ لە جاشەکانیش رۆیشتن کۆمەڵێ جاش‌و عەسکەریش لە دەور ئێمە ماونەوە. کۆپتەرەکەیش بەو ئاسمانەوە هەر ئەسوڕایەوە، کە زەلامەکانیان سوار کرد رەسمچی تیابوو بڵاچەی ئەدا لەو بانەوە رەسمیانی ئەگرت. ئەوانیان بردو ئێمەیش کەوتینە شیوەن‌و لاوانەوە. یەکێ ئەڵێ بەخوا چاومان پێیان ناکەوێتەوە، یەکێ ئەڵێ ئەیانکوژن، هەریەکی قسەیەك ئەکات. منداڵیش کە گوێیان لە ئێمە دەبوو بە گریانەوە وامانئەووت ئەوەنەی تر هاواریان ئەکردو بانگی باوکیانیان ئەکرد. نزیکەی سەعاتێ بۆ دوو سەعات ئێمەیان بەو شێوەیە هێشتەوە. ئیتر منداڵ هەبوو خۆی پیسکردبوو، نە پەڕۆیە نە پاتاڵێکی وامان پێیە، ژن هەبوو فەقیرە خۆی پێڕاناگیراو شوێنێ نەبوو هەر تاراتێك بکەین.

هێشتا رۆژی مابوو کۆمەڵێ زیل عەسکەری بەتاڵ بەدوای یەکا هاتن‌و لەولای ئێمەوە راوێستان. بە ئێمەشیان وت یەڵا سەرکەون. گشت ئەو خەڵکەیان خستە ناو زیللەوە، بەرز بوون‌و بەهیلاکەت سەرکەوتین. پیرەژن وامان بووی فەقیرە هێز لە ئەژنۆیا نەمابوو بە چوار دەستە خستیانە ناو زیللەکانەوە. ژن‌و منداڵ ئەو چوار پێنج ئاواییە هەموومانیان بارکرد، من خۆم پێنج منداڵم پێبوو، عەسلی خوشکم‌و براژنەکەم ژن

غازی برام ئەویش پێنج منالّی پێبوو خۆیشی دووگیان بوو. کچێ ئامۆزای منالّەکانم ناوی هێرۆ بو کەوتبووە تەك ئێمە ئەویشمان لەگەلّ بوو. ئامینەی براژنمو منالّەکان کاکەم سالّەح ئەوانیش پێنج منالّ بوون. ئەوانەی تریش ئەوەی خەلّك سۆران بوو هەمووی هەر خزم بوونو دێیەکان تریش هەمووی ناسیاوو کەسی یەکتر بووین. بەرەو جەعدە قیرەکەی قادرکەرەم کەوتنەڕێ. بۆ کوێمان ئەبەن مەگەر هەر خواو سەیاق زیلەکان بزانن. ئەو هەموو جاشو جەیشەی لەوێ بوون هەمووی کەوتبووە دواوو پێشی زیلەکانەوە ئەتووت بەدوای سەیارەی بووکەوەن. ئێمەیش خۆمان تینوو برسیو ترساو، هیلاكو ماندوو، ئەوەنە گریابوین قوڕگمان وشك بوو بوو. کە گەیشتینە سەر جادە قیرەکە بەرەو بان مەقان سوڕانەوە وتمان بەخوا ئیشەلّا ئەمانبەن بۆ چەمچەمالّو راستیانکردوە لەگەلّمان. چونکە ئەو جادەیە بەرەو ژویر ئەچوو بۆ زەردە لەوێوە یان دەچوو بۆ قادرکەرەم یان هەلّئەگەڕایەوە بەرەو لەیلانو کەرکوك. بەملایشا بهاتایا دەهاتە بان مەقانو ئیتر دەبوو دوو رێگا یان بۆ چەمچەمالّ یان بۆ شار دەچوو. جاشەکان وتیان موجەمەعتان بۆ کریاوە لە شۆڕش، بەلّام نەیانووت لەکوێوە ئەتانبەین بۆیە بەهەر لایەکا بڕۆیشتایا هێشتا هەر وامان ئەزانی رێگەی موجەمەعەکە لەوێوەیە، کە بەرەو بان مەقانیش هەلّسوڕان وتمان هەر

بۆ موجەمەعمان دەبەن چونکە ئەگەر بۆ کەرکوك بوایا لە زەردەوە[٧٨] نزیکتر بوو تا بێتەوە لەمراوە لە بان مەقانەوە بڕوات بەرەو کەرکوك.

کەس بیری بانگو ڕۆژوی نەما کاتێ خستمانیانەڕێ دەمەو مەغریب بوو نزیکەو بانگ. لەناو زیلەکان هەریەکی قومێ ئاومان خواردو تیکەیە نانە وشکەو دوو قووم دۆ، ئەویش بە زۆر لە قوڕگمان ناچووە خوارەوە. کۆپتەرەکانیش تا کەوتینە سەرجادەکەو تاوێ ڕۆیشتین هێشتا بەبان سەرمانا هەر ئەسوڕانەوە ئەوەنە نزم بوون سایەقەکان جوان لێمانەوە دیاربوون. من پێشتر کۆپتەرم بینی بوو چونکە زۆر جار کە لە کەرکوکەوە ئەچوون بۆ لای قادرکەرەم بە نزمی بەسەر مامشەیا ئەچوون، بەڵام زۆرێك لە خەڵکەکە یەکەمجار بوو ئاوا لە نزیکەوە بیبینن هەر بەجاری زراویان چوو بوو ئەوەنە نزم بوو ئەمانووت ئێستا ئەکەوێتە سەرمانا یان باڵەکانی لێمان ئەدا.

لە ڕێگە هەروا سەیارەی عەسکەری بوو ئەهاتن‌و ئەچوون، هەبوو پڕی لە چەکدار بوو هەبوو پڕ کرابوو لە کەلوپەلی ناو ماڵ‌و ئەشیا، ئیتر کە ئەوەمان بینی هەندێکمان زیاتر باوەڕمان کرد کە بۆ موجەمەعمان ئەبەن‌و ئەوەتا خۆیان ماڵ‌و حاڵەکەیان بۆمان هێناوە. حاجی ئەحمەد خەزورم بابای مناڵەکان ئەیووت بەخوا من شەست‌و سێم باش باش لە

٧٨ - زەردە گوندێکە لە ناوچەی جەباری، لە ئاستی ئەو گوندە دوو ڕێگای سەرەکی کەرکوك قادرکەرەم و چەمچەماڵ قادرکەرەم پێکدەگەن، خەڵکی ناوچەکە بە مەفرەقەکەی زەردە ناوی دەبەن.

بیره چۆن تاڵیان کراینو ئەوە فەرهودە ماڵەکانمانەو بەتاڵانی ئەیبەن. ئیتر یەکێ لەولاوە ئەیووت ئەوە رەنگە ئەشیای دایەرەکان حکومەت بێت لە قادرکەرەمەوە ئەیهێننەوە، هەر یەکی قسەیەکی ئەکرد. بەڵام کە بینیمان ئەو قەراغ جادانە هەروا رەوە جاشو عەسکەرییەو مێگەلە مەڕو مانگاو کارو بەرخیان داوەتەپێش، هیچ شوانێکیشیان لەگەڵ نەبوو، ئیتر لە هەموو شت کەوتینە گومانەوەو تەواو ترسمان لێنیشت. ئینجا دیمەنی باوك منداڵەکانو براکانم دەهاتنەوە بەرچاووم کە سواری زیلەکان بوونو ئەمووت بەخوا ئیتر چاومان بەیەك ناکەوێتەوە. نەك هەر من هەموو ئەو ژنو منالانەی لەناو ئەو زیلە عەسکەرییانە بوون بەبینینی دیمەنی تالانیو فەرهودی جاشەکان، کەوتبوونە ئەو خەیالانەوە کە ئیتر چاومان بەکەسوکارمان ناکەوێتەوە، یان ئێمەیش ئەبەن بۆ حەپسخانە یان ئەگەر بەڕاستیشیان بووبێ بمانبەن بۆ موجەمەع بەڵام زەلامەکانمان تا مردن دەبێ لە سجنابن، بۆیە لە ئاواییو لەو هەردە چەنێ گریابووین، لەناو زیلەکانو بەبینینی مەڕوماڵاتەکانمان دوو ئەوەنە هاتووهاوارمان کردووە. کەسیشمان عەرەبیمان نازانیو ئەو دوو جوندییەی لەناو زیلەکانیش بوون هەر بە عارەبی دەیانخوڕییە سەرمانا کە لەشوێنی خۆمان دانیشین، هەندێ قسەیان دەکرد هیچ تێنەدەگەیشتین بەڵام لە ئیشارەتەکانیان حالی دەبووین کە دەبوو کەس هەڵنەسێتە پێوەو لە شوێنی خۆمان دانیشین.

ڕەنگە سەعاتێکمان پێچووبێ تا گەیاندمانیانە ناو چەمچەماڵ‌و ئیتر دونیاش خەریکبوو تاریک دائەهات. لەوێ لیوایەك هەبوو لە نزیك ماڵەکان شوێن کۆپتەری لێ بوو هێنامانیانە ناو ئەو لیوایەو لەو ساحەیە دامانیانگرد. ئێمە وامان ئەزانی هەر ئەو ئاواییانەی ئێمەو دێیەکانی دەوری قادرکەرەم گیراون، بەڵام لەوێ بینیمان چی حەشاماتێك لەوێ یە. بڕوا بکە ئەڵێ دەرزی هەڵدەی بەزەوی ناکەوێ ئاوا بوو. لە هەموو دێیەکانەوە خەڵکیان هێنابوو. لە یەکتریمان ئەپرسی خەڵکی کوێن یان لە کەیەوە لێرەن، ئەمە کوێیە موجەمەعە یان مەعەسکەرە، سەیر ئەکەین خەڵك لای سەنگاوو ئەو دێنایەشی گشت لێیە. هەروا لایتی سەیارەیە بەڕیز بە دوای یەکا دێن‌و خەڵك دائەگرن. ناو ئەو ساحەو مەعەسکەرە رەشی ئەکردەوە، منداڵێکت لەو قەرەباڵغییە لێ ونبووایا ڕەنگە بەحەیاتی نەتدۆزیایەتەوە. لەلایەك خەڵك ئەگریا، هەبوو بانگی کەسوکاری ئەکرد، هەبوو تینوو برسی هاواری بوو بۆ قومێ ئاو، ڕۆژی حەشر چۆنە ئاوها بوو. ئیتر ئێمە لەوێ تەواو دڵنیابووین جاشەکان درۆیان لەگەڵمان کردووەو ئەو قسەوباسانەی لە ئاوایش بیستبوومان کە حکومەت عافواتی داوەو زەلامەکان هەفتەیە دەبەن‌و تەسریحیان ئەکەن‌و خەڵکەکە دەباتە ئۆردوگا هیچی ڕاست نەبووە. ئەو خەڵکەی هێنابووییە ئێرەو ئەو هەمو جەیشە بەدیارییەوە بۆ ئەوە نەبوو بمانێرێ بۆ موجەمەع، دیار بوو هەمومان دەستگیرکرابووین، هەر ئەوکاتەی لە ئاوایی جاشەکان ئێمەیان گرتووەو کە سواری زیلەکانیان کردین

گواستنەوەمان بووە بۆ سجن، نەك بمانگەیەننە شوێنی ئۆردوگا. چەنێ خەمی چارەنوسی خۆمان بوو دوو ئەوەندە لە خەمی باوك منداڵەکانو براو کەسوکارەکەی ترمان بووین کە هیچمان لەبارەی ئەوانەوە نەئەزانی، ئەبێ چیان بەسەر ئەواندا هاورد بێ، بۆ کوێیانیان بردبێ، ئەبێ قومێ ئاویان دەستکەوتبێ ڕۆژووەکانیان بشکێنن، کوێرایم دابێ کە لە ماڵ کەوتینەڕێ بۆ خوار ئاواییو لەوێوە بردمانیان بۆ لای ئاواییەکان تر وەك محەمەد کولێرەو دۆیەکەی نەهێنا، خۆمان هەندێ نانو ئاوو دۆمان هێنابوو ئەمانووت نەك هەتا کاتی فتار نەگەینە جێوڕێی خۆمان، بەڵام کە لەیەك جیاکراینەوە پریاسکە نانو مەتارە دۆو ئاوەکان کەوتنە لای ئێمەوە ئەوەنە عەقڵمان پێا نەشکا لەوێ بەشیکەین، زەلامەکان بەدەست بەتاڵ سوار کریان. ئەبێ عەسکەرەکان ئەوەنە ویژدانیان هەبووبێ تیکەیە نانو هەنێ ئاویان دابێت پێیان. بەخوا هەموویان بەڕۆژوو بوون کە لە ئێمە جیاکرانەوەو بردیانیان. هێشتا پریاسکە نانەکە تیای مابوو ئاوو دۆیەکەیش مابوو ئەمووت بەڵکوو لێرەبنو بیانبینمەوە بیاندەمێ، خەم ساڵەح برامو ماڵو منداڵ سەلمەی خوشکم بوو، چاوم ئەگێڕا بزانم ئەبێ لێرە نەبن، خەم دایکمو باوکمو منداڵەکان عەلیو نوری برام بوو، ئەبێ گەیشتبێتنە جێی خۆیان، یان کێ ناڵێ لە ڕێگە ئەوانیشیان نەگرتووەو هاوردبێتیان بۆ ئێرە، خەم نوری برام بوو بە زمان بەڕۆژوەوە بەلای رانەکانەوە بوو ئەترسام ئەویشیان گرتبێ. بە بابای منداڵەکانم ئەووت بەخوا رەنگە هەموویان

لێرەبن بزانە نایاندۆزیتەوە. ئەویش لەناو جەرگی کە زەلامەکان جیاکرانەوە دوو کوڕی تیابوو حەزی ئەکرد بچێت بەدوایانا بگەڕێت، خەمی نەوەکانی هەردوو کوڕەکەیشی بوو ئەترسا لە ئێمەیش دابڕێتو دوای ئێمە نەدۆزێتەوە. خەڵکی هەندێ لە گوندەکان هەموو خێزانەکان پێکەوەبوون ژنو منداڵو پیاوەکانیان، هەرچەندە هەموومان هەر کەوتبووینە بەر رەحمی خواو ئەو زاڵمانەوە بەڵام ئەمووت خۆزگە ئێمەیش لە ئاوایی لەیەك جیا نەکرابینەوەو هەمومان پێکەوە ئەبووین. پیاوەکانمان لەگەڵ بوایا هەر لەناو زیلەکان لەگەڵ ئێمە رۆژووەکەیان ئەشکاند، ئێمەیش بەو شێوەیە نەئەترساینو هیلاك نابووین بەدەست گریانو هاواری منداڵەکانەوە. خۆ ئێمە غەزوریشم لەگەڵمان بوو، بەڵام بەتەنیا چی بکردایا منداڵ منو ماڵو منداڵ بورهان شوبرامو خوشكو خوشکەزاو براژنەکانمو منداڵەکانیان هەر ئەوەندەی خۆمان سی چل کەسێك ئەبووین.

لەناو لیواکەی چەمچەماڵ ئەوەنە نەمانیانهێشتەوە، خەڵکەکەیان کۆمەڵ کۆمەڵ کردبوو هەندێ پرسیاریان دەکرد ناوت چیەو خەڵکی کوێیو چەند کەس پێکەوەنو پیاوەکەت لەکوێیەو ئەمانەیان لێمان پرسیو وابزانم ناونویس بوو دەفتەری بەدەستیانەوە بوو ئەیاننوسی. ئیتر هەروا کاروان بەدوای یەکا سەیارە ئەهاتو خەڵکی دائەگرت، ئێمەیان بەزیل عەسکەری هێنابوو، هەبوون لە کۆستەردا بوون هەبوو بەگلابەو

ته‌ره‌کته‌ر ده‌یانیانهێنا. چه‌نێ سه‌یاره‌ به‌دوای یه‌کا دێو خه‌ڵك دائه‌گرێ
تۆ بڵێ دوو ئه‌وه‌نه‌یش له‌لایه‌تره‌وه‌ خه‌ڵکیان بار ئه‌کردو ئه‌یانبرد.

ئه‌وه‌نه‌ی پێنه‌چوو ئه‌و کۆمه‌ڵه‌ خه‌ڵکه‌ی ئێمه‌ که‌ له‌و چوار پێنج ئاواییه‌وه‌ پێکه‌وه‌ هێنابوومانیان، له‌وێش له‌ناو لیواکه‌ی چه‌مچه‌ماڵ هه‌ر پێکه‌وه‌ له‌ له‌لایه‌که‌وه‌ کۆمه‌ڵمانیان کردو هه‌نێ عه‌سکه‌ر ئه‌ملاوئه‌ولایان گرتین، خوایه‌ ئه‌بێ چیمان لێبکه‌ن وا لێره‌یش جاکریاینه‌وه‌ له‌و خه‌ڵکه‌، له‌تاواو له‌ترسا هه‌ر ئه‌گریاین‌و ئه‌پاڕاینه‌وه‌، هیچ ده‌سه‌ڵاتێکی ترمان نه‌بوو، ئێ لێره‌ جاشیشی لێنه‌بوو هه‌تا پرسیارێ شتێ بکه‌ین، که‌سیش نه‌یئه‌وێرا له‌ عه‌سکه‌رێ نزیك بێته‌وه‌ به‌ڵکوو خوابکات کوردی بزانێ‌و بزانین چی له‌و خه‌ڵکه‌ ده‌که‌ن.

به‌و شه‌وه‌ سه‌یاره‌ی سه‌رداپۆشراویان هاوردو ئێمه‌شیان به‌ڕیزو به‌دوای یه‌کتریدا خسته‌ناو ئه‌و سه‌یاره‌ سه‌رداپۆشراوانه‌وه‌[٧٩]. هه‌ر سه‌یاره‌یه‌کی چه‌ند خێزانێکی ئه‌گرت، ئێمه‌ وه‌ك چۆن له‌ناو زیله‌که‌یش هه‌موومان هه‌ر پێکه‌وه‌بووین لێره‌یش ده‌ست مناڵه‌کانمان گرتبوو غه‌زوریشم وه‌ك شوان به‌دیارمانه‌وه‌ هه‌تا له‌یه‌ك دانه‌بڕێین‌و هه‌موومانیان کرده‌ ناو یه‌کێ له‌و سه‌یاره‌ سه‌رداپۆشراوانه‌وه‌. من به‌ پێنج مناڵه‌وه‌ عه‌سلی خوشکم‌و

---

[٧٩] - له‌ هه‌ندێ چاوپێکه‌وتنی تر که‌ نوسه‌ر له‌گه‌ڵ شایه‌تحاڵه‌کانی ئه‌نفال ئه‌نجامیداون، جیاوازییه‌ك هه‌یه‌ له‌نێوان یاده‌وه‌ریاندا، هه‌ندێکیان به‌و جۆره‌ ده‌یگێڕنه‌وه‌ که‌ له‌ چه‌مچه‌ماڵ بۆ تۆپزاوا به‌سه‌یاره‌ی (موقه‌پەت) براون، له‌ تۆپزاوا بۆ دوبز به‌سه‌یاره‌ی کۆسته‌ر یان گلاّبه‌. به‌شێکی تریان پێیان وایه‌ له‌ چه‌مچه‌ماڵه‌وه‌ بۆ تۆپزاوا به‌سه‌یاره‌ی گلاّبه‌و کۆسته‌ر براون و له‌ تۆپزاوا بۆ دوبز به‌ سه‌یاره‌ی (داخراو) گواستراونه‌ته‌وه‌.

ئامین برازنم خێزان سالّح برام بوو به پێنج منالّەوه، نەسرین برازنم ژن غازی برام بوو ئەویش به پێنج منالّەوه، ژنێكو دوو منالّ بورهانو غەزورمو یەك دوو خێزانیّ تریش هەر لەگەلّ ئێمه سوار كریان. دەرگای سەیارەیان داخست ئەوەنەی پێنەچوو كەوتبووەریّ ناو ئەو سەیارەیه ئەتووت سەرشۆركە[80] داخكریاوه هەر خەریك بوو بتاسێین كونێكی تیا نەبوو هەر نەفەس بدەین، نازانم گەرماییان هەڵكرد بوو بەقەستی وایان لێمانكرد یان هی ئەوەبوو سەیارەكه نەفەسبڕ بوو، وەك پەنجەرەیشی تیا نەبوو هەروا تاوێك بوو كەوتبووەریّ گلۆپ ناو سەیارەكەیشیان لێمان كوژاندەوه، خۆمان بەو هیلاكیو ماندوێتیو برسێتییەوه ناو ئەو سەیارەیەش ئەوەنەی تر ناڕەحەتی كردین ئەمانووت ئێستا هەموومان ئەخنكێین. منالّ كەوتبوونه دلّەكوتیّو هاواریان ئەكرد دایكه وا ئەمرم. دایكیان كوێربواباو ئەو رۆژانەمان نەبینیایا. یەكیّ هاواری ئەكرد دایه تینومه یەكیّ برسی بوو، یەكیّ ئەیووت میزم دیّ تەنگاوم، هەنیّ منالّ له ترسا هەر زوو خۆیان پیسكردبوو، ناو ئەو سەیارەیه هەلّمو بۆنو بەرامەیەك بوو خەریكبوو دلّمان دەرئەچوه دەرەوه. خۆیشم چەند مانگیّ بوو دوگیان بوومو هەناسەم توند دەبوو، ئیتر وەزعێكمان بەسەرهات مەگەر ئەو خوایه خۆی بەو بان سەرەوه ئاگای لێبووه بزانیّ چۆن بوو.

---

[80] - سەرشۆرك داخكریاو، حەمامی گەرمكراو.

بردمانیان سەعاتەڕێ یە زیاتر ئەم سەیارانە ڕۆیشتوون، ئێمەیش هەر خوا هێشتمانییەوەو لەناو سەیارەکان نەمردین. نازانم ئەم زاڵمانە ئەم سەیارانەیان بۆ وا دروستکردبوو، بۆ دوو قل پەنجەرەیان تێنەکردبوو هەر هەوایەك بکێشێ، لەوە ئەچوو سەیارەکانیان بۆ عەزاب ئێمە دروستکردبێ بۆ ئەوەی ئەگەر بۆ کوشتنیشمان بەرن هەتا روحمان دەرئەچێ عەزابی زیاتر بچێژین. خۆزگا یەکێ لە سەدامی ئەپرسی ئەو خەڵکە، ژن‌و منداڵ‌و پیرێژن‌و ئەختیار، چی تاوانێکیان هەبوو وا وایان لێمان ئەکرد. ئیشەڵا لە قیامەتیشا بێت ئەو غەدرەی بەسەرەوە ناڕوات. خۆم هێزم لەبەر بڕابوو منداڵەکانم هەر یەکە بۆ شتێ ئەنوزایەوە جەرگم هەڵئەقرچا، چاو چاوی نابینی‌و هەروا گوێت لە ناڵەو هاتووهاواری ئەو خزم‌و کەسەی ناو سەیارەکە بوو ئەپاڕانەوەو هاواریان ئەکرد توخوا مردم. غەزورم لە کورسییەکەی تەنیشتمەوە دانیشتبوو، نەهرۆ بوو ئەگەر ئارام بوو یەکێ لەمنداڵەکانی کردبووە باوەشی، ئەو بەتەمەن بوو گوێم لە هاتوهاواری بوو کەوتبووە هەناسەبڕکێ ئەموت ئێستا رووحی دەرئەچێ، ئەموت خوایە ئەگەر یەکێ لە منداڵەکان یان بابایان شتێکی لێبێت من بەیانی بەچی روویەکەوە بە محەمەد باوکیان بڵێم بەو جۆرە مردن.

وردە وردە ڕۆیشتنی سەیارەکان خاو بوونەوەو زانیمان لایانداوە، ئیتر بەهێواشی ئەڕۆیشت. کەمێك ورەمان کەوتەوەبەر ئیشەڵا رائەوەستن‌و قاپی سەیارەکە ئەکەنەوەو جارێکی تر هەوای ئەو خوایە هەڵئەمژین.

ئەوەنەی پێنەچوو کە سەیارەکان هێواشیان کردبووەوە، راوەستان ئیتر هەموو ئومێدمان هاتبووە سەر ئەوەی زوو ئەو دەرگای سەیارەیە بکەنەوەو بۆ یەکجارێکی تر هەوایەك هەڵمژین. دەرگایانکردەوە هەوایەکی فێنك هاتە ناو سەیارەکەوە وەك ئەوە وابوو رووح بکەیتە بەر مردوا ئاوا هۆشمان هاتەوە.

دامانیانبەزاند لە ئێمەوایە بەهۆی گەرمی ناو سەیارەکەوەیە واهەوا ئەوەنە خۆشە، بەڵام سەیر ئەکەم بارانێکی نەرمو خۆش ئەباری، لەبەر ئەو بارانە تاوێ رامانیانگرت ئاو بەسەرو لەشمانا هاتەخوارەوە، ئەوەنە بارانێکی خۆش بوو بە عومرم بارانی تری وام نەبینییەوە. ئێمە کە لە ئاوایی‌و هەردەکە بووین هەوروهەڵا بوو هەنێ بارانیش باری، بەڵام لەچاو ئەم بارانەوە وەك پروشە وابوو. کە بردمانیانە چەمچەماڵیش هەنێ گەواڵە هەوری هێنا بەڵام لەوێ باران نەبوو. لێرە بارانێکی زۆر بوو، وتم خوا ئەیزانێ ئێرە چی کوێستانێکە. بەڵام چونکە بەهار بوو هەر تاوا بارانێك بوو زوو لێیکردەوە.

هەرچەندە شەو بوو دونیا تاریکتریش بوو، بەڵام گڵۆپی کارەبا زۆر دانرابوو ئەو دەشت‌و دەرەی هەموو رۆشن کردبووەوە، سەیارەی زۆریش ئەهاتن‌و ئەچوون، لەبەر شەوقی لایتی سەیارەکانیش ئەو ناوەمان هەموو لێوە دیاربوو. کە لە چەمچەماڵ خستمانیانە ناو سەیارەکانەوە چونکە سەرداپۆشراوو بوون هیچ شوێنێکمان لێوە دیار نەبوو، نەمانئەزانی ئایا هەر ئێمەین یان خەڵکی تریشیان لەگەڵ ئێمە

هێناوه بۆ ئێره، بەڵام لەوێ که دامانیانگرته خوارەوەو تاوێ لەبەر بارانەکه رایانگرتین، سەیری ئەو هەموو سەیارەیەمان کرد بەدوای یەکترییەوە راوەستابوون ئەتووت دەنك تەزبیحە لوتیان نابووە یەکەوە ئەوەنە زۆر بوون. هەروا خەڵکیان دائەگرت‌و لە نزیکی سەیارەکە کۆمەڵ کۆمەڵ دەکران، چەند عەسکەرێك هاتن ئەو کۆمەڵە خەڵکەی ئێمه که پێکەوەبووین بردمانیان بەرەو ساحەیەك سەیر ئەکەم رەش ئەکاتەوە لەبەر خەڵك، خوا عەلیمە رەنگە بەقەدەر شارێك مەخلوق لەوێ کۆکرابێتەوە.

ئێمەیشیان بردو تێکەڵ ئەو خەڵکە کراین، له هەموو لایەکەوه هەروا کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکی تریش بوو ئەیانیانهێنا. ژن‌و منداڵ‌و پیاوی گەنج‌و پیر، هەرچیان ئەهێنا تێکەڵ ئەو خەڵکەی تر ئەکران. بەڵام هەر له ترسی ئەوەی یەکێکمان دانەبڕێ هەموو وەك جوجکە مریشك خۆمان گرمۆڵه کردبووه یەکترییەوە. ئیتر ئەوانەی له دەوربەرت بوون هەمووی پرسیاری لەیەکتری ئەکرد خەڵك کوێن، له کوێوه هاتوون، له کەیەوه لێرەن، بۆمان مەعلووم بوو ئەم شوێنه نزیك کەرکوکەو ناوی (تۆپزاوا)یە، ئەوەشمان زانی هەر ئاواییەکان ئێمه نین، ئەو ناو گەرمیانه لای کەلارو کفری‌و ناو داوێ‌و جاف‌و زەنگنه هەمووی لەوێ خڕکرابووینەوه. حکومەت نیازی چی هەیه مەگەر هەر خۆیان خوا بزانێ.

بەو شەوە کەوتنەوە ناونووسینی ئەو خەڵکە، یەکەم پرسیاری ئەوەبوو ناوی خۆتو باوکو باپیرت، تەمەنت چەندە، ئینجا پرسیاری ئەوەیان ئەکرد خەڵکی کوێی، ئەگەر یەکێ شوویکردبێ ئەیانپرسی ناوی مێردەکەت، ئیشوکاری چی بوو، براو کەسوکارت، چەند منداڵت هەیە، تەمەنی منداڵەکان. لەکوێ دەستگیرکرایت، براویتە کوێ، کەست پێشمەرگە بووە، فیرارتان هەبوو. چەکتان پێبوو کە گیراوون، هەموو ئەمانەیان ئەپرسی. ئیتر هەروا کۆمەڵ کۆمەڵ بانگ ئەکراو ناو ئەنووسرایا. لەوێش لەکات ئەو ناونووسینە جارێکی تر کەوتنەوە جیاکردنەوەی خەڵك، جارێ هەرچی پیاو هەبوو لە ژنو منداڵەکان جیا دەکرانەوە، لەناو پیاوەکانیش ئەوەی گەنجو بەخۆ بوو لەپرو کەنەفتەکانیان جیاکردەوەو دەکرانە دوو کۆمەڵی جیاواز. لەولای ساحەکەوە کۆمەڵێ خانوی درێژ درێژ هەبوو وەك گەلەخان بەڵام زۆر درێژ بوون. زەلامە گەنجەکانیان رووەو لایەکی ئەو خانووانە بردو پیرە پیاوەکانیش بەلایەکی ترا. ژنو منداڵیش بۆ وەجبەیەکی تر لەو خانووانە.

ئێمە پێشتر هەر لە هەردەکەی نزیك ئاوایی جیاکرابووینەوە لەگەڵ زەلامەکانمان. هەندێ پیرەمێردمان لەگەڵ مابوو ئەوانیش لێرە جیاکرانەوە. بەڵام خەڵکێ زۆریش هەبوون هەر لە دێیەکان خۆیانەوە هەموویانیان پێکەوە هێنابوو لەوێ جیاکرانەوە، بوو بووە هاتو هاوارو شیوەنو گریانێ مەپرسە.

پێشتر هەر خۆزگەم ئەخواست باوك منداڵەکان و براکانم لەگەڵمان بوونایا، ئەمووت بۆ مەرگیش بێ پێکەوە بین، بەڵام سەیرم کرد لەوێ ئەوانەی پێکیشەوە بوون هەموویان جیاکرانەوە، دوعای خێرم دەکرد بەس نەبوو لەگەڵمان نەبوون و رەزالەتی ناو ئەو سەیارەیەیان نەبینی. هەر ئەپاڕامەوە خوایە ئەوان شوێنەکەیان باشتربێ. بەخوا دیمەنیان لەبەرچاوم لاناچوو، ئەمووت ئەبێ رۆژووەکەیان شکاندبێ، ئەبێ ئەوانیشیان نەخستبێتە ناو سەیارەکەی ئاوا گەرمەوەو وەك ئێمەیان بەسەر نەهاتبێ، دڵخۆشم ئەدایەوە تا ئیشەڵا ئەوانیان بە ئامانە بردووەو جامی شوشەی پێوە بووە.

لەوێش جارێکی تر هەناسە ساردمانیانکرد کە پیاوەکانیان جیاکردەوە، حاجی ئەحمەد بابای منداڵەکان بە سەرو ریشی سپیی و کەشیدەکەی پشتییەوە دەستیکرد بە گریان، دیار بوو بۆ بەدبەختی ئێمە ئەگریا، لە هەردەکە کوڕەکانی لێ جیاکریانەوەو وا لێرەش لە نەوەکانی دایئەبڕن. ئەو وەك کۆڵەکە وابوو بۆ ئێمە چونکە لە مامشە ئەو چەند ساڵە هەر پێکەوە بووین و کە چووینە سۆرانیش هەر لە گەڵمان بوو، بەخوا لە باوك خۆم زیاتر خۆشمئەویست، لە عەسریشەوە کە باوك منداڵەکانیان برد، تاکە ئومێدم خواو غەزورم بوو. ئێمە ئەم برکە ژن و منداڵە پیاوێکمان لەگەڵ نەبێ لەناو ئەو هەموو خەڵکە غەریبەو لە بەردەست ئەو زاڵمێلە چۆن بتوانین بژێین، ئەڵێن روح لەجێی سەختەو دەرناچێ، بەخوا ئەبوو ئێمە هەر لەوێ روحمان دەرچوایا.

هەر بە بەرچاوامانەوە ئەوانیان دایە بەر پاڵ بەرەو ئەو خانووە درێژانە، ئەوان پێیانئەوت (قاعە)، ئەوانیان کردە ئەو قاعانەوە کە بۆ پیاو دیاریکرابوون، ژنو منالێش دوای ئەو ناونوسینە بەرەو هەندێ قاعەی تر بردمانیان.

وەك شێتم لێهاتبوو هەر جاری دالغەیەکم ئەکرد، پێشتر خەم دایكو باوکم بوو حەزم ئەکرد لێرە پێکەوە بوینایا، کە ئەمبینی وا بەتەمەنەکان لەو خەلکە جیائەکەنەوە، ئەپاڕامەوەو شوکرانەم ئەکرد کە دایکمو ئەوانمان لەگەڵ نەبوو، هەرچەندە هیچ هەواڵێکیشمان لەبارەیانەوە نەئەزانی، ئایا گیراون رزگاریان بووە یان نا؟ بەلام ئەمووت بەرگەی ئەم هەموو مەینەتیە ناگرمو شێت ئەبووم ئاوا دایكو باوکمیان بەبەرچاومەوە ببردایا. پێشتر ئەوان لەماڵو وەك ئەوەی بۆ میوانی بچن لەیەکتر دابڕاین، وەك ئەوە نەبوو ببینیت وا عەسکەر بە زۆرو بەپاڵ دەیانبەن.

ئا با بیرم نەچێ تەفتیشێکی ئەو خەلکەیان کرد ئەتووت بۆ مرواری ئەگەڕێن هەموو لەشمان گەڕان. ئاخر بۆ ئێمە حەیاچوون بوو عەسکەر عارەب دەست بدات لە گیانت، ئێستایش نازانم چۆن هەر لەوێ گیانمان دەرنەچووەو ماینەوە. لەوە ئەچوو خوا بۆیە هێشتمانییەوە هەتا مەینەتی زیاتر ببینین. ئیتر ئەوەی قلێ ئاڵتوون بەگیانییەوە بوایا یان گوارە لە گوێی بوایا، بەخوا ئەلقەو موستیلەی دەستمان ئەوانەیشیان برد. دەفتەر نفوسو هەرچی پارە بەو خەلکە بوو لێمانیان سەند. من

خۆم دەفتەر نفوس خۆمو منالّەکانو دەفتەر خدمەی محەمەد کە لە عەسکەری تەسریح بووە ئەوەیشم پێبووو هەموویان لێمان سەند. پەنجا دیناریشمان هەبوو لە مالّەوە لە پریاسکەیەکا شاردبوومانەوە هێشتا هەر لە ئاوایی بوویمان دامە دەست باوك منالّەکان وتم با لای تۆبێت. بەلاّم کە لە مالّ دەرچووین چاوی بە جاشەکان کەوت، دەستیکردە باخەلّیا پارەکەی دایەوە لای من وتی نەك جاشەکان گیرفان زەلامەکان بگەڕێنو بیبەن با لای تۆ بێت، ئەگەر شتێکیش بوو بیکە مەسرەف منالّەکان. منیش هەر لە ئاوایی کە جاشەکان جیامانیان کردەوە وەعدێکم بەخوا دا دە دیناری بکەمە رای خواو مەولودی پێغەمبەر هیچمان بەسەر نەیات. کە بردمانیانە ناو لیواکەی چەمچەمالّ لەوێیش خێرێترم قەرار دا، لە تۆپزاوا وتم ئەوەی ماوەتەوە ئەوەیش ئەکەمە خێر بەس نەجاتمان بێت، ئیتر دیاربوو خوا نەیکردبووە قسمەت لە تۆپزاوە کە گیانمان گەڕان لەناو دەستەسرێك توند پێچابووم لە چمك کەواکەما بوو دۆزیانەوەو بردیان.

دوای ئەوەی گیانمان گەڕان ئیتر سوڕانمانیانەوە بەو دیوو ریزێ قاعەیا بردمانیان بەرەو ژوورتر، دیار بوو ئەوانە قاعەی ژنو منالّ بوون. سەیر ئەکەم کوڕ گەنج هەروا لە چواردە پانزە سالّ بۆ سەرەوە هەموو ریز کریاونو دەستو چاویان بەسترياوە، ئیتر ریزو دوان نەبوو، ئەتبینی وا ریزێك بە دەستو چاو بەستراوی دانیشتوون، ریزێ لەولاوە بە پێوە

راوەستێنراوون. خوا هەزار شوکر بەس نەبوو براکانم‌و باوک منداڵەکانمان لەگەڵ نەبوو، ئێخۆ شێت ئەبووین ئاوا بیانمان بینیایا.

کە ئەوانمان بەو شێوەیە بینی ئیتر وتمان بەدڵنیاییەوە زەلامەکان ئێمەیشیان بۆ ئێرە هێناوە. لەخۆمانمان ئەپرسی باشە ئەگەر تەسریحیان ئەکەن بۆ چاویانیان بەستۆتەوەو بۆ دەستیان بەستوون، خۆ قابیلە راناکەن. منالێ کەوتبوونە ترس‌و لەرزێکەوە مەپرسە هەمووی خۆی نوساندبوو بەلەشمانەوەو دەترسان، هەواڵی باوکیان ئەپرسی‌و ئەگریان. خێزان ئەوکاتە وەك ئێستا نەبوو منالێ دوانی هەبێت، یەکێ گەورە دەکەن ئەوجا منالێ تریان ئەبێ، ئێمە ئەوکاتە منالێ بەدوای یەکا لەدایکئەبوون. خیزان وابوو رەنگە دە منالی پێبوبێت‌و یەکی سالێ بەینیان بوو. من خۆم پێنج منالم پێبوو، گەورەکەیان نەبوو بووە دە سالێ، خۆم دوگیان بووم‌و کۆرپەیەکیش بە باوشمەوە بوو، ئەوەکانی تریش ورد بوون. وەرە بەو وەزعەوە بتوانە وەڵامی پرسیاری منالێ بدەرەوە، یەکێ هاوار ئەکا ئەڵێ کوا باوکم، یەکێ ئەڵێ برسیمە یەکێ ئەڵێ میزم دێ، یەکێ خۆی پیسکردووە، یەکێ هاوار ئەکات سەرمامە. نە جل‌و جۆرێکت پێیە نە پەڕۆیە، نە لێفە شرێ. ئێستا گێڕانەوەی هەر بەدەم ئاسانە.

بەو حاڵەوە کردمانیانە ناو قاعەوە، قاعەی چی، جمەی دێ لە خەڵك. هەروا بە زۆر خەڵکیان تێئەتەپاند. ئێمەشیان کردە ژورەوە زریك‌و زاوی

ژن‌و منالْ ئەچوو بە ئاسمانا. هەموو هیلاك‌و ماندوو تینوو برسی. گشت ئەو خەڵكە كەتووە بەسەریەكدا، دیمەنێك بوو یاخوا كەس نەیبینێ.

دوای نیوو سەعاتێ ئەبوو خرابووینە قاعەكەوە چەند عەسكەرێ هاتنە ناو ژورەوە، چەند فەردەیەك بەدەستیانەوە بوو دیار بوو سەمونی تیا بوو، هەر یەكی سەمونێكیان دا بەو خەڵكە، ئەوەنە رەق بوو بتدایەتە سەر زەلاما ئەیشكان، بەڵام بەخوا ئەوەنەمان برسی بوو لە تاوا نازانم بڵێم هەر چۆن خواردمان. بەڵام چەنێ ئەو خەڵكە هاواری بۆ ئاو دەكرد ئەو شەوە چۆڕێ ئاویان نەداوە پێمان. ئێمە هەتا ناو لیواكەی چەمچەماڵ مەتارەی ئاومان پێبوو، لەوێ كە خستمانیانە سەیارە سەرداپۆشراوەكانەوە نەیانهێشت لەگەڵ خۆمان بیهێنین، بەڵام هەبوو لە قاعەكە نیوە شەو بوو سوێندی ئەخوارد هێشتا فتاری نەكردۆتەوە. چونكە خەڵكەكەیش گشتی هیلاك بووین وەك رانەمەڕ بەسەریەكا بە تینوێتی‌و برسێتییەوە خەومان لێكەوت.

بەیانی شەبەقی نەدابوو لە غەڵبەغەڵب‌و گورەو نەڕەی سەیارە خەبەرمان بوویەوە، منالْ هەمووی تینوو برسی، كەوتوونەتە كوڕوزانەوە. یەكێ داوای شیر لە دایكی ئەكات یەكێ هاوار ئەكات باوكم ئەوێ. ئیتر هەروا ژنەو لەتاوا ئەلاوێنێتەوە. بە وەجبە دەرگایان لەو خەڵكە كردەوە بچنە سەر ئاو، بە قەدەر تینوێتیی‌و برسێتی، هیلاكی ئەوەش بووین شوێنێ هەبێ هەر تاراتێكی لێبكەین. هەر جاری دە دوانزە كەسێكیان ئەبردە دەشتەوە ریزێ (ئاودەست)ی لێبوو، لە

نزیکیشی هەندێ بۆڕی ئاو هەبوو هەتا توانیمان ئاومان خوارد، لەوەتەی خۆم ناسیبووەوە تا ئەو کاتە تەنها ئەو ڕۆژە لە مانگ رەمەزانا بە ڕۆژوو نەبوومەو لە تینوا نەمتوانی ئەو ڕۆژە بەڕۆژوویم. خۆمان فێنك کردەوەو ئامێکمان بەبەرا هاتەوە. هەرچەندە هێشتا دنیا گەرم نەبوو بوو سەرەتای بەهار بوو، بەڵام چونکە زۆر بووین لەناو ئەو قاعەیەو دەرگاو پەنجەرەی هەموو داخرابوون ئەتووت جەهەنمە. دوای ئەوەی بە وەجبە ئەو خەڵکە هەمووی برایە دەشتەوەو هاوردمانیانەوە، ئەمجارەیش هەریەکی سەمونێ رەقیان داپێمان، نازانم ئەو سەمونە هەر بۆ ئەو خەڵکە دروستیانکردبوو یان پێشتر هەبووە، چونکە ئێمە قەت سەمون وامان نەبینی بوو، خۆ من هاتووچۆی شارم زۆر کردبوو لە ماڵ عەزیز شوبرام چەند جارێ مابوومەوە سەمونخانە لای ماڵیان هەبوو، سەمونم بینی بوو خڕو پان بوو، ئەمە باریكو درێژ بوو. هەرچەند ئەیانووت ئەمە سەمون عەسکەرییە، بەڵام باوەڕ ناکەم حکومەت سەمون ئاوا رەقو خراپی دابێتە عەسکەرەکان خۆی، هەر بۆ ئێمە کردبوویان دیار بوو. پیرەژنو منداڵ دان لە دەمیانا نەبوو سەمونەکەیش ئەوەنە رەق بوو ناو دەمیانی هەموو کردە زام. بەڵام دوای فێری ئەوە بووین بە بەرد وردی بکەین وەك کەپەك ئاردمان لێئەکرد ئەوجا ئەمانخوارد.

قاعەکان پەنجەرەی باریك باریکی تیابوو، لەوێوە دەتتوانی دەشتەوە ببینی. راستە ئێمە شەو لەبەر گڵۆپو لایتی سەیارەکان خەڵکمان زۆر بینی، بەڵام وەك ئەوە نەبوو کە ئێستا بەچاو رۆشنا لێتەوە دیارە. خوا

عەلیمە گەنم رەشگوڵ چۆنە ئاوا سەر زەلام لەو ساحەیە رەشی ئەکردەوە. لە دەلاوە کاروان سەیارەت ئەبینی هەروا ئەوێستیاو خەڵکیان دائەگرد. ئێمە بە سەیارەی سەرداپۆشریاو هاوردمانیان، هیچمان نەبینی، ئێستا سەیرم ئەکرد بە گلآبە، بە کۆستەر بە ئامانە درێژەکان بە زیل عەسکەری، هەروا بەڕیز سەیارە ئەهاتو ژنو منالًو زەلامی دائەبەزاند.

تۆپزاوا دەشتێك بوو ئەمسەرو ئەوسەری دیار نەبوو، هەموو لایەکانی بە تەلبەند گیرابوو بە باڵای زەلام بەرزتر. کۆمەڵێ قاعەی درێژ درێژ بەدەم یەکەوە دروستکرابوون، لەولاوە هەنێ خانووی لێبوو وەك بلێی دایەرەی گەورەکانیان بوو، عەسکەری زۆر بەدەورییەوە بوون، ئەو شوێنە بوو کە شەو لەوێ ناومانیان نوسیو گیان ئەو خەڵکە گەڕانو شتەکانیان لێمان سەند، هەر لەوێ خێزانەکانیان لەیەکتری جیا ئەکردەوە. لەو پەنجەرانەوە هەموو هەر چاومان بە دەرەوە بوو، هەرکەسەو ئەیویست بزانێ ناسیاوێ کەسێکی نابینێ، ئێمە چاومان بۆ محەمەد باوك منالەکانو هەردوو براکەمو زەلامەکان ئاوایی ئەگێڕا، ئەمانووت کێ نالێ ئەوانیش ناهێنن بۆ ئێرە، هەر خۆم بیرم ئەکردەوە دوێنێ ئەوان دەمەو عەسر بارکریان ئەگەر هاوردبێتیانیان بۆ ئێرە هەر دوێنێ گەیشتوون، ئینجا بیرم ئەکردەوە ئەی کێ نالێ لەناو ئەو گەنجانە نەبوون کە دەستو چاویان بەسترابوو، هەرچەندە شەو بوو بەلآم بەخوا ئەوانی تیا بوایا هەر بە بەژنو باڵایان ئەیانمناسییەوە، ئەمووت ئیشەڵا ئەوانی تیا

نەبوون، بەڵکو خوا بکات وەك ئێمە قوڕکریا بەسەرماناو درۆیان لەگەڵمانکرد، بەڵکوو درۆیان لەگەڵ ئەوان نەکردبێ‌و بیانبەنەوە بۆ چەمچەماڵ‌و ئازادیان بکەن.

هەر لەو پەنجەرە باریکەوە تەماشای دەرەوەمان ئەکرد کاکەم ساڵح‌و کاك نەجمەدین زاوامانم بەرچاو کەوت مێردی (سەلمە) خوشکە بەشووەکەی کۆرمۆرم، ئەویان دابووە نەجمەدین شەهاب لە کۆرمۆرو خوشکێ نەجمەدینیشیان دابووە کاکەم. کردمە بانگە بانگ خوایە گوێیان لێ بێت‌و کاکەم دەنگەکەم بناسێتەوە تا بزانێت ئێمە لێرەین. هەر خەریکبوو خۆم کەوڵکەم ئەوەنە هاتوو هاوارم کرد، وەڵا خوا کردی کاکەم ئاوڕی دایەوە دیار بوو دەنگەکەمی ناسی‌و زانیبووی ئەوە دەنگی منە بانگی ئەکەم، هاتن بەرەو پەنجەرەکە، هەر ئەوەنە چاوی بە ئێمەو ژن‌و منداڵەکانی کەوت‌و بەو حاڵەوە ئێمەی بینی، کەوتە باوکەڕۆ و براڕۆ، ئەو لەو دیوو پەنجەرەکەوەو ئێمەیش هەموو لەم دیوو لەناو قاعەکەوە خەریکبوو هارو شێت بین. ئێمە بەئومێدبووین ئەوان نەکەوتبێتنە دەست جەیش‌و جاشەکە، ئەویش هەر بەهیوای ئەوە بووە کە وەك خۆیان دەستگیرکراون خوا وایکردبێ ئێمە نەگیرابین. هەواڵی براکانم‌و مێردەکەم‌و غەزورمی پرسی، چیان بەسەرهات؟ پێمانووت کە جەماعەت حەسیب حەمە ئینجە هاتن گشت زەلام ئاواییان لە هەردەکان هاوردەوەو بردمانیان لەو هەردەی نێوان بانگۆل‌و شێخ مەحمودو قۆچەلی جگە لە بەتەمەنەکان زەلام ئەو ئاواییانەیان گشتی هەر لە

هەردەکە جیاکردەوەو خریانە زیل عەسکەرییەوە بردیانیان نازانین بۆ کوێ برياوون. حاجی بابای منالەکانیش لەگەڵمان بووی دوێ شەو لێرە لێمان جیا کریایەوە. پرسیار هەواڵ نوری برامو منالەکانیو دایکو باوکمو خێزانو منالەکان عەلی برامان کرد بەشکو هەواڵێکیان بزانی، ئاگای لەحاڵ کەس نەبوو، بەس ئەیووت ئەوەی من لەو ڕێوبانە بینیوومە کەس نەماوە هەموویان گرتووە، باسی خۆیانیکرد لەگەڵ سەلمەی خوشکمو منالەکانیو زاواکەمان بەرەو سۆران هاتین، جەیش لەو سەر ڕێیانە بوو نەمانوێرا لادەین بەرەو چەمچەماڵ چووین لە بان مەقان گرتمانیانو قورکریا بەسەرمانا، بردمانیانە چەمچەماڵو لەوێوە بردمانیان بۆ دایەرەی ئەمنی سلێمانی، دوو ڕۆژ لە سلێمانی هێشتمانیانەوەو لەگەڵ کۆمەڵێ خەڵکا هاوردمانیان بۆ ئێرە. وتمان ئەی کوا سەلمەو منالەکان، هەردوکیان دەستیانکرد بە گریان وتیان ئەوانیش هەر گەیشتینە ئێرە لە ئێمە جیاکریانەوە نازانین خراونەتە چی قاعەیەکەوە بەڵام هەر هان لەیرە. نزیك دە دەقەیە بەدیارمانەوە مانەوەو هەر کوڵەی دڵمان ئەهات. ئیتر یەك دوو عەسکەر چاویان پێوە بوو ئەم دوو زەلامە لای قاعەکەی ئێمەن لە دویرەوە تێیانیان خوڕیو ئەمانیش خواحافیزیان لە ئێمە کردو ڕۆیشتن، ئیتر من نەیانمبینیەوە.

بەڵام دوای ماوەیەك لە دوبز هەندێ ژنو منال مامشە یەکمانگرتەوە، ژنێك ناسیاومان ناوی (نازدار حەمەعەلی) بوو خەڵك مامشە بوو، لە ئاوایی پێکەوە بووین تا ئەو ڕۆژەی دێیەکەیان سوتان. لە ڕۆژ

دێڕمیانەکەوە یەکتریمان نەبینی بوو، ئەوانیش وەك ئێمە چۆن چوبووینە سۆران ئەوانیش لەگەڵ چەندماڵێکی تری ئاوایی چووبونە دێی (گۆلباخ) ئەیووت جێمان سەغڵەت بووەو هەتا دوو مانگ شوێنمانیان کردۆتەوە، دوای چووبونە (ژاڵەی بان رۆخانە- قادرئاوا) تا زستان لەوێ بوونەو زستانیش چوبوونە (مەحمود پەریزا) تا ئەو کاتەی ئەنفالکراین لە (مەحمود پەریزا) مابونەوە. وەك ئێمە قورکریا بووە سەریاناو بە ماڵ و مناڵەوە گیرا بوون، ئەو لە دوبز بۆمی گێڕایەوە کە لەپەنجەرەی ئەو قاعەیەوە کە لێی بوون سەیری ساحەکەی کردووە ساڵەح برامی بینیووە نوێژی کردووە، عەسکەرێ چووە لەدواوە شەقێکی داوەتە گازەرای پشتیاو بەدەما خستوویەتی، بە پالەقەوە چووەتە سەر پشتی ساڵەح برام. ئیتر هەر خەریکبوو شێت ئەبووم لە تاوا، کاکەم ساڵەح خۆی نەخۆش بوو عەمەلیاتی کردبوو بەخوا (٢٢) تەقەڵ بە لاتەنگەیەوە بوو، چی تاوانێکی کردووە وا لێی بدەن، ئەترسام ئەمووت بەخوا بەرگەی نەگرتووەو رەنگە هەر لەوێ جێوەجێ رووحی دەرچووبێت، ئیستاو ئەوسا ئیتر هەواڵێکی ساڵحمان دەست نەکەوتەوە.

خەڵك هەبوو دوای لە نوگرەسەلمان گەڕایەوە، هەبوو لە تکریت، کەس نەبوو بڵێ لە سجنێکا چاوم پێی کەوتووە. سەلمەی خۆشکم و کاك نەجمەدین زاوامان برابوونە نوگرەسەلمان، ئەوانیش لە تۆپزاوا لێی دابڕابون ئیتر نەیانبینی بوو. ئاخر نازانم خوا بۆچی ئەو هەموو زوڵمەی قبوڵ ئەکرد، وا ئێمە خاوەنمان نەبوو کەس لەسەرمان بە جواب ناهات،

خۆ ئەو نوێژی بۆ خوا کردووە، خوا لەسەر ئەو نوێژەکە بۆ نەهاتۆتە جواب.

توخا با ئەوەیشم بیر نەچێت (نازدار) ئەوەیشی گێڕایەوە وتی دووەم ڕۆژمان بوو هاوردبوومانیانە تۆپزاوا ئەو کاتەی ئەچووین بۆ سەرئاو کە ڕۆژی جارێك ئەمانیانکردە دەرەوە، لە دوورەوەو لە پەنجەرەی قاعەی زەلامەکانەوە یەکێکیان نازداری بینیبوو ناسیبووی وەك چۆن من کردبوومە بانگە بانگ کە کاکەم ساڵەحم بینی، ئەویش کردبوویە بانگە بانگو بانگی نازداری کردبوو، ئەیووت ئەپاڕایەوە بۆ ئاو، ئەو وەجبەیەیان زۆر تینوو برسی کردبوو، وتی نەمانتوانی ئاوی بۆ بەرم، چونکە عەسکەر حەرەسمان بوو تا ئەچووینە ئاودەستەکەوەو تا ئەگەڕاینەوە ناو قاعەکەی خۆمان. بەڵام ئەمیش لە دویرەوە زەلامەکەی ناسیبووەوە ئامۆزای منداڵەکانی بوو. ناوی (شێرکۆ)[81] بوو ئەو پێشمەرگە بوو، ئیتر نازانم لە کوێ گیرابوو، بەڵام بە دیلی کەوتبووە دەست عەسکەرییەکانو ئەویشیان هاوردبوو لەو قاعەیەی تۆپزاوا بوو لەناو قاعەی گەنجەکان (نازدار) سوێندی خوارد بە چاو خۆی بینیبووی.

ئیتر بەدرێژایی ئەو ڕۆژە من هەر خۆم بەو پەنجەرەیەوە نوساندبوو چاوم ئەگێڕا بەڵکوو خوایە جارێکیتر کاکەم ببینمەوە، یان چاوم بە

[81] - شێرکۆ نوری محمد ١٩٦٤ مامشە، لە ١٩٨٢ بووەتە پێشمەرگە لە تیپی ٥١ی گەرمیان لە ریزەکانی ی،ن،ك، لە پرۆسەی ئەنفال دەستگیرکراوەو وەك دەیان هەزار گەنجی ئەنفالکراوی تر بێسەروشوێن کراوە.

سەلمەی خوشکم یان منالێکیان بکەوێت. که کاکەم وتی هەموو خەڵك گیراوە ئیتر کێچ کەوتبووە کەوڵم بۆ دایكو باوکمو منالەکان نوریو عەلی، ئەوەنەی له تۆپزاوا بووین مەگەر ئەوکاتانەی خەوم لێکەوتبێ چاوم لەسەر ئەو خەڵکە لابردبێ، هەر ئەمووت بەڵکوو بیانبینمەوە.

بۆ رۆژی دواتر وتم خۆ نه نان هەیەو نه ئاو، هەرچۆنێك بێت نیەتەکە بێنمو بەرۆژووبم باشترە بەڵکو ئەو خوایەیش بەزەیەکی پێمانا بێتەوە، شەو خەوتین نیەتم هێناو بەیانی سەمونەکەیان داپێمان هەڵمگرت وتم ئێوارە فتاری پێئەکەمەوە. ئێ هەر سەعاتێ دوای ئەوە منالّ ئەکەوتەوە هیلاکەتو برسیان ئەبوو داوای نانو ئاویان ئەکرد، ئێمە پێشتر له ماڵو حاڵ خۆمان وا ڕاهاتبووین رۆژی سێ جار نانمان ئەخوارد، لەکوێ ئێستا به سەمونە رەقێ بیستو چوار سەعات ئیدارە ئەکەیت، وەڵا لەتاو منالەکان هەر چێشتەنگاو بوو ئەو سەمونەی هەڵمگرتبوو بۆ فتار دامە منالەکان، ئێوارە کاتی فتار هاتو هیچ نەبوو بیخۆم، هەتا خوا رۆژی کردۆتەوەو تا ئەوکاتەی نۆرەی سەمونی رۆژی دواییمان هاتووە من لەتاو برسێتی تلاومەتەوە، سوێنم خوارد ئیتر نابێ رۆژو بگرم، کەچی خۆم نەگردو له سجنەکەی دوبز دەستمکردەوە به نوێژو چەند رۆژێکیش بەڕۆژو بووم.

ئەو سێ شەوو سێ رۆژەی له تۆپزاوا ماینەوە هەر جارێ چوونبینە سەرئاو کردن، ئەوەنە خۆم دوا ئەخست هەتا عەسکەرەکان به قامچی ئەکەوتنە گیانم، ئەمووت بەڵکوو سەلمە ببینم یان ناسیاوێ بێتو بڵێ

خوشکەکەت لە فلان قاعەیە، یان هەواڵێ باوك مناڵەکانو براکانم دەست کەوێت، یان ئەگەر دایکو باوکمو مناڵەکان عەلیو نوری برام گیرابنو نەگەیشتبنە کەرکوك، بەلام هیچ هەواڵو سۆراخێکیان نەبوو.

لەلایەك خەمی خۆمانو مناڵەکان، لەلایەك خەفەت باوکیانو چارەنوسی براکانم، خەمو خەفەتی سەلمەو مناڵەکانی، دایکو باوك، هەر چاکە شێت نەبووین لە تاوا.

ئەو سێ شەوو سێ رۆژەی لە تۆپزاوا بووین قیامەتمان بەچاو خۆمان بینی. بۆ یەك سەعاتێ چییە نەمانبینیووە خەڵك نەیەنو خەڵك نەبەن. بیستو چوار سەعات بەدوای یەکا کاروان سەیارە هاتووە خەڵکی داگرتووە، ئەو عەسکەرانەی لەوێ بوون پەیتا پەیتا خەڵکیان لەیەك جیاکردۆتەوەو کۆمەڵیان کردوونو سەیارەی تر هاتووەو باریان کردوون.

بە بەرچاومانەوە خێزانەکانیان دابەشئەکرد: پیرێژنو پیرەمێرد بەجیا کۆمەڵ ئەکران، زەلام گەنج بە جیا، ژنو مناڵ بەجیاو کچە عازەوەکانیش لەلایەکی ترەوە بەجیا. دووەم رۆژیش بەیانی زوو تازە دونیا رۆشن بووبوویەوە کۆمەڵێك مونشەئەیان هێنا لەبەردەم دەرك قاعەکان راوێستیانو لە هەر قاعەیەکو کۆمەڵێ خەڵکیان خستە ناو مونشەئەکانەوەو بردیانیان، خەفەت ئەوەیش بەقەدەر هەمووی هەبوو، نازانم بڵێم هەر مونشەئەی چەند کەسی ئەگرد بەلام دیار بوو بە ژمارە نەفەریان تێئەکرد، خێزان وابوو نیووەی بەر ئەوە کەوتن خرانە مونشەئەکانەوەو نیوەکەی تریان هەر لە قاعەکە مابوونەوە. مناڵو دایك

ئاوا لەیەکجیاکرانەوە. ئامینەی برازنم خێزانەکەی کاکەم ساڵح خۆی‌و منالّەکانی خرانە ئەو ریزەوە کە سواری مونشەئەکەیان بکەن، لە بەختەکەی ئەوان دایکەکەو دوو کچی‌و تاقە کورێکی بوو سوارکریان‌و پاسەکە پڕ بوو، دوو کچی منالّی مایەوە نەیانهێشت لەگەلّ دایکەکەیان برۆن کەوتنە تەك ئێمە یەکێکیان ناوی نەجیبە بوو ئەوی تریان ناوی گولّەباخ بوو. لە هەموو قاعەیەك وایانکردبوو، دوای کە گوێزراینەوە بۆ دوبز لەوێ ئەمانبینی منالّ هەیە بەتەنهایەو دایکی لەگەلّ نییە، دوای شەش مانگ زانیمان دایکەکانیان کە خرانە ناو ئەو مونشەئانەوە برابوون بۆ نوگرەسەلمان. سەیر زالّمی ئەوانە بکە وەك دایکەکەیانت برد بۆ نوگرەسەلمان ئێ منالّەکانیشتان لەگەلّیان ببردایا، بەجیا منالّەکانیانی هێنابوو بۆ دوبز بۆ ئەوەی لە برسا بمرن. بە درێژایی ئەو شەش مانگە من چەنێ خەم‌و خەفەتم لە منالّەکان خۆم خواردووە ئەوەنە زیاتر خەمی ئەو دوو کچەی برازامم بووە، نازانم خەویان ئەبینی چی بوو شەوی دەجار بانگ دایکیان ئەکرد، بەخوا لەگەلّ منالّەکانم خۆم فەرقیانم نەکردووە دایمە بەسەر شان‌و کۆشمەوە بوون، بەلاّم هەر نازی بێدایکیان پێوە دیاربوو. ئێستایش هەر ئەلّێم نازانم ئەو خوایە لە ئاست ئەو هەموو زولّمە بۆ بەجواب نەهات.

پیرێژن‌و پیرەمێرد سەرو ریش سپیت ئەبینی بەگۆچان رێیان ئەکرد، ئاخر ئەوانە ئەبێ چی تاوانێکیان هەبووبێ، حاجی کەشیدە بەسەرت ئەبینی ئەیاندایە بەر پالّ ئەتووت دوژمن باوە کوشتەیانە. نازانم ئەی

ئەو عەسكەرانە بۆ ئەوەنە زاڵم بوون ئایا خۆیانماڵو مناڵیان نەبوو، ئەی خۆیان لەماڵەوە دایكو باوكیان نەبوو، ریش سپیان نەبوو، نازانم ئەمانە لەكوێ گەورە بووبوون وا قەدر لەخۆیان گەورەتریان لانەبوو. هەریەك لەو عەسكەرانە بەقەدەر سەدام تاوانبار بوون بەرانبەر ئەو خەڵكە بێ دەسەڵاتە. ئەوان ئەوەنە زاڵم بوونو تۆبەبێت خوایە خوایش ئەوەنە بێباك بوو بەرانبەریان. كەچی ئەو خەڵكەی ئێمە بەو حاڵەیشەوە بەڕۆژوو بووین. چونكە مانگ رەمەزان بوو ئێمەیش قەت فێر نەبووین لە رەمەزانا بەڕۆژوو نەبین، بۆیە بەو حاڵەیشەوە شەو نییەتمان ئەهێناو بەیانی كە سەمونەكەیان ئەدا پێمان هەڵمانئەگرد تا مەغریب، تەنها بەو سەمونە رەقە فتارمان ئەكردەوە. ئێ ئەگەر بە رۆژوویش نەبوایاین خۆ هیچ نەبوو بیخۆین، وتمان بۆ گوناحەكەیش بێتە سەرمانو خۆمان قەرزاری لای خوا بكەین هەتا بتوانین رۆژووەكە ئەگرینو كە نەیشمانتوانی ئیتر دەسەڵات چییە، قابیلە خوا خۆی نەزانێ نەمانتوانیوە بیگرین.

سێیەم رۆژیشمان بەو دەردەسەرییە بەڕێكرد، بۆ شەوەكەی كۆمەڵێ عەسكەر رەشتاڵەی ناشرین هاتنە قاعەكەمانەوە كەوتنە ناو ئەو خەڵكە لە مناڵ بەرمەمكەوە هەتا ئەوەی دە دوانزە ساڵانیش بوو ئەیانكردە پەلیاو لە دایكی جیایان كردەوەو بردیان. دوای زانیمان وایان لە قاعەكانی تریش كردبوو. تۆ وەرە بیهێنە پێشچاو خۆت بەزۆر مناڵێك لە دایكی بسەنە بزانە ئەو مناڵەو ئەو دایكە چی ئەكەن، ئەی وەرە ببینە

چوار سەت پێنج سەت ژن لە قاعەیەکابێتو عەسکەر بێتو هەرچی منالّی تیایە بەزۆر بیبات، دەبێتە چی هاتوهاوارێك هاوارو نزای ئەو خەڵکە ئەگەیشتە کەشکەلانی فەلەك. ناو ئەو قاعەیە بووە رۆژی حەشر. هەر ئەوەنە لە ریزی لای دەرگاکەوە پەلاماری منالّیاندا ئیتر هەرچی منالّ بوو بەجارێ تۆقین کردیانە قیژەو هاوارو هەر منالّەو باوەشی ئەکرد بەدایکیا، خۆیان ئەخستە ژێر کەواو کراسەکانمانەوە. ژنەکان لە منالّەکان خراپتر کەوتنە خۆکوشتنو لەخۆدان. عەسکەرەکانیش چونکە رەحم خوا لە گیانیانا نەبوو بەشەقو شەپازلەو بە قۆناغە تفەنگ کەوتنە گیان ئەو خەڵکەو بەزۆر منالّیان لە باوش دایکی دەرئەکرد. لە منداڵ بەرمەمکەوە تا ئەوەی کە ئیتر لەخەم رەخسابوو هەموویان پەلکێشکرد. ئێستاش ئاهو نزولەی ئەو شەوە وا لە جەرگماندایە، هارو شێت بووین شیوەن دنیامانکرد. منالّمان نوساندبوو بەسنگ خۆمانەوە، لەتاوا خۆمان دابووە مل منالّەکانداو هەموویانمان خستبووە ژێر دەستو پای خۆمان، ئاخر من هەر پێنج منالّەکەی خۆمو هێرۆی کچ بورهان شوبرامو نەجیبەو گولّەباخ برازام هەموویان لەو تەمەنەیا بوون کە ئەیانکرد پێیانداو ئەیانیانبرد، وەرە هەشت منالّت بە زۆر لێبسێنن‌و روحیشت دەرنەچێ. هەروا لەلای دەرگاکەوە بەسەر ژنەکاندا دێن‌و منالّەکان ئەبەن، خوا ئاگادارە ئەوەی لەوێ بینیمان کە پەلوپۆی منالّیان ئەگرتو هەلّیانئەدا لە دوکان مریشك فرۆشیش نەمانبینیوە وا لە مریشك بکەن، چوارو پێنج پەلی منالّیان بە هەردوو دەستیان بەرز

دەکردەوەو هەڵیانئەدایە ئەولایەی وا منداڵەکانیان لێخڕکردبووەوە، ئیتر حسابکە قاعەکە بووە دوو بەشەوە زۆربەی منداڵ بوو، بەشەکەی تریشی دایك منداڵەکان، کە هەموویان ئاوا جیاکردەوە ئیتر دەرگای قاعەکەیان کردەوەو منداڵەکانیان هەموو بردە دەرەوە. منداڵ هەموو شیوەن و گریانێتی، ئێمە وا خۆمان ئەکوژین، ئەوەنە هەڵبەزینەوەو پاڕاینەوەو لە خۆماندا سودی نەبوو. کە گەیشتنە لای من لەترسا وەك مریشك هەر هەشتیانم خستبووە ژێر خۆمەوە عەسکەرێ رەش زلە بە پۆستاڵەکەی شەقێکی دایە سەر سینگما هەناسەی لەبەرم بڕی و هەڵمیدایە ئەولاوە، هەناسەم سوار بوو هیچم بۆ نەوترا، لەتاوا خۆم خستەسەر پۆستاڵەکانی عەسکەرێکی ترو ماچی پۆستاڵەکانیم کرد تا منداڵەکانم نەبەن، ئەم زاڵمەیشیان لەباتی ئەوەی کە پێیم ماچکردووە بەزەیی پێما بێتەوە بەقژ لەو عەرزە بەرزمی کردەوە. منداڵیان برد، بەدەست عەسکەرەوە وەك چۆڵەکە هەڵئەلەرزین. بڕوا بکە وەك ئەوە وابوو دەمارێك لەناو دڵمەوە راکێشن، خەریکبوو بەدوایانا دڵم لە سینەمدا ئەهاتە دەرەوە. دایکیان کوێربێ گشتی ئەتووت بەرخە کۆرپەن لەبەر مەڕ هەڵیگری ئاوابوو، قیژەو هاواری ئەو دایکانەو زیڕەی منداڵ عەرزو ئاسمانی پڕکرد، ئەبوو خوا هەر ئەوکاتە شەقێکی لە سەدام هەڵدایا، نازانم بۆ بەجواب نەهات. لەکوێ بووە منداڵ شیرە خۆرە لە بەر مەمك دایکی بڕفێنێ. هەتا ئێستا هەر بیر ئەکەمەوە ئەڵێم بۆچی ئەو منداڵانەیان برد، ویستیان چیان لێبکەن، بیانکوژن، کیمیایی بکەنە بانیانە، بیانخەنە بەردەم

سەگەکان (عودەی)[٨٢] نازانم بەنیازی چی منداڵەکانیان لێمان جیاکردەوە؟

ئێمە جاری وایە لەداخا قسەیەك ئەکەین ئەڵێن نەك بووبێتە کفر سەتجار روو ئەکەینە قاپی خواو تۆبە ئەکەین، نازانم ئەو عارەبانە رەحم خوا لەدڵیان نەبوو، نازانم گوێچکەیان کەڕ بوو وا بەزەییان بەو هەموو پاڕانەوەو تکاو نزاو هاوارەی ئێمەیا نەهاتەوە. ئەڵێم باشە ئەگەر منداڵیان هەبووبێ کە منداڵەکان خۆیان ببینن دەبێ منداڵەکان ئێمە نەچنەوە پێشچاویان، ئەبێ شەوان خەویان لێبکەوێ لەتاو زیرەو هاواری منداڵەکانمان. خۆ لەوەتەی خوا دنیای خەلق کردوە پیاو خراپیش هەر هەبووە، بەڵام بەخوا قەت زاڵمی وەك ئەو عەسکەرانەی تۆپزاوای خەلقنەکردووە. هەرچەند بیر ئەکەمەوە نابێت ئەوانەو ئێمە هەردولامان هەر خوا خەڵقمانی کردبێ، رەنگە ئەوانە لە بنیادەم نەبووبن. نازانم خۆیان جەرگیان نەبوو، نازانم ویژدانیان نەبوو، نازانم بەشەر نەبوون چی بوون. بەخوا بەم دوو چاوەی خۆم بینیم دایك هەبوو منداڵەکەی بەر نەئەدا پەلێکی هەر بەدەست دایکەوە بوو پەلەکەی تری منداڵەکە عەسکەرەکان رایانئەکێشا ئەو منداڵە خەریك بوو بپچڕێت بەدەستیانەوە، قیژەو هاواری ئەو دایكو منداڵە خەڵکی ئەتۆقان، کەچی وەك ئەوەی

---

[٨٢] - عودەی کوڕی گەورەی سەدام حوسێن بوو ١٩٥٤- ٢٠٠٣، لەناو کۆمەڵگەی عیراقی وا باس دەکرا کە چەند سەگێکی هەن مرۆڤیان دەرخوارد ئەدرێ. ئەوکەسانەی دەکەوتنە بەر غەزەبی عودەی، بە زیندوێتی ئەیکردنە خۆراکی سەگەکانی.

قورقۆشم لە گوێیاندا توێندرابێتەوە هیچ خۆیان تێکنەئەدا، مەگەر یەکێ هەر پەلاماری بدایا یان دەستی لەمناڵەکەی هەڵنەگرتایا قۆناغە تفەنگێکیان ئەدایا سەریا ئەیانکەواند. چەند ژن هەر بێهۆش کەوتن، هەر هاروشێت بووین، ئەوەنە هاوارمانکرد ئەوەنە گریاین ئەوەنە قژمان رنیو لەخۆماندا بتبینیایا ئەتووت کەسیان بەساغی نامێننەوەو هەموویان هارو شێت ئەبن.

بردیانیان پێئەچوو لە قاعەی نزیکمان دایان نابێتن، چونکە ئێمە گوێمان لە هاوارو بانگکردنەکانیان بوو هەر دایکە دایکەیان بوو. خۆ کەس سەعاتی پێنەبوو بەڵام رەنگە ئاوا دەور دوو سەعاتی پێچووبێت ئێمە هەر شیوەن ئەکەینو گوێشمان لە گریانی مناڵەکانمانە، بەخوا درۆ نییە ئەگەر بڵێم لەناو قیژەو هاواری ئەو هەموو ژنو مناڵە گریانی مناڵەکان خۆم ئەناسییەوە. شێت بووین هاربووین، نازانم خوا بوو لەسەرمان هاتە جواب، رەحمی خوا بوو چووە دڵیانەوە، نازانم یان بەرگەی ئەو هەموو شینو گریانەی ئێمەیان نەگرت، بەهۆی چییەوە بوو دیار بوو پەشیمان بوبونەوە لەوەی بەتەمای هەرچییەك بووبێتن بەرانبەر بە مناڵەکان، وەك وتم رەنگە دوو سەعاتی پێچووبێت، هاوارو زیرەی مناڵەکان نزیك دەبوونەوە لێمان، هەتا دەهات دەنگەکان نزیکتر دەبوونەوە، سەیرمانکرد مناڵیان هێنایەوەو دەرگای قاعەیان کردەوە، ئیتر هەروا مناڵ بوو بۆ باوەش دایکی رایئەکردو دایك خەریکبوو مل خۆی بشکێنێ وا ملی ئەنا بەرەو پیری مناڵەکان. رۆڵە مناڵ بەو دوو سەعاتە چاویان

بوو بووە گۆمی خوێن ئەوەنە گریابوون، نازانم تۆقیبوون هی ترسەکە بوو یان هەر هی گریانەکە، بەڵام ئەتووت خوێ کراوەتە ناو چاویانەوە. ئەوەنە ترسابوون نیوەیان هەر خۆیان پیسکردبوو، هەڵئەلەرزین. لەوێ بەوەیا زانیمان وایان لە قاعەکان تریش کردووە لەگەڵ منداڵەکان ئەو قاعەیەی ئێمە منداڵ تریشیان هێنابوو کردیانە قاعەکەی ئێمەوە، کە هەرکەس منداڵ خۆی لەدەوری کۆکردبووەوە چەند منداڵێکی تر هەر ئەگریانو چاویان بۆ دایکیان ئەگێڕا، زانیمان ئەمانە لە قاعەی ترەوە بە هەڵە هاوردیانیانەتە لای ئێمە. ئیتر هاتن بردیانیان. بەڵام دوای لە دوێز بۆمان دەرکەوت منداڵ هەبووە ئەو شەوە دایکی بۆ نەدۆزراوەتەوە، بەیانی دایکی براوە بۆ نوگرەسەلمان منداڵەکە لەگەڵ ئێمە هاوردبوویان بۆ دوێز. سەعاتێکیش ئەبوو هاوردبوویانیانەوە هەر خۆیان ئەنوسان بەسنگمانەوەو وایان ئەزانی دێن جارێکیتریش ئەیانبەن. هەرچی منداڵ هەبوو لەو شەوەوە هەمووی توشی نەخۆشی بوو، لە دوێز زۆربەیان مردن. ئیتر هەبوو فێی لێئەهات، ئەبورایەوە، هەتا عافواتەکەیشی داوەو هاتووینەتەوە هەر سەعاتێ قاپی ئەو قاعەیە بکرایەتەوە منداڵ رایئەکردو باوەشی بە دایکیا ئەکرد وای ئەزانی عەسکەرەکان بۆ ئەوان دێن. ئەو شەوەمان بە عەزابێ رۆژ کردەوە مەگەر هەر ئێمە بەسەرمان هاتبێ، یارەبی خوایە گاوریش وای بەسەر نەیات.

بەیانی تازە رۆژ هەڵهاتبوو هاتن سەمونە رەقەکەیان دایە ئەو خەڵکەو دەرگای قاعەکەیان دانەخستەوە لەسەرمان، دیار بوو عەسکەرەکان هەر

بەیەکا ئەهاتن‌و وەك بڵێی چاوەڕێی شتێکیانە. ئەوەنەی پێنەچوو بانگمانیان کردە دەشتەوە بە دوای یەکتریا بردمانیانە ساحەیەك کۆمەڵێ گڵابەی درێژ درێژ وەستابوون ئەمەی وا بلۆك‌و شتی پێدەگوێزنەوە سواری ئەو سەیارانەمانیان کردو کەوتنەڕێ بەرەو شوێنێکی تر پێیانئەوت مەعەسکەری دوبز.[٨٣]

لە تۆپزاوا بۆ دوبز رەنگە هەروا سەعاتە رێیەك بوایا، خۆی لە راستیا ئێمە نەمانئەزانی بۆ کوێمان ئەبەن مەبەستم ئەوەیە کە کەوتینەڕێ سەعاتێکمان پێچوو تا ئەو شوێنەی دامانیانگرد، ئێمە نەدیوو نەشارەزا نەك خۆمان باوکیشمان ئەو ناوەی نەبینیبوو، تەنها سواری گڵابەکان کراین‌و ئیتر مەگەر خوا بزانێ بۆچی دۆزەخێکی ترە، بەڵام چونکە ناو سەیارەی دوا بەتاڵ بوو دەرودەشت‌و ئاسمانمان لێوە دیاربوو، وەك ئەوجارە ناڕەحەت نەبووین کە بە سەیارە سەرداپۆشراوەکان لە لیواکەی چەمچەماڵەوە هێنامانیان بۆ تۆپزاوا. لە تۆپزاوایش ئەو سێ شەوو سێ رۆژە ئەوەنە رەزالەتمان بینی، بەتایبەت دوێنێ شەو بە جیاکردنەوەی منداڵەکان لێمان، تۆپزاوامان لێبوو بوو بە جەهەنم، بۆیە بێ ئەوەی بزانین ئەو شوێنەی بۆی ئەچین کوێیە، پێمان خۆش بوو کە لە تۆپزاوا گوێزراینەوە. لەدڵ خۆمدا ئەموت مادام بەسەیارەی

---

[٨٣] - بنکەیەکی کۆنی سەربازی بووە لە نزیك ماڵەکانی ناوەندی قەزای دوبز، لە کۆمەڵێك قاعە پێکهاتووە، مەزەندەی ئەوە دەکرێت ٢٥٠٠٠ ژن و منداڵی ئەنفالکراو لە نیسان تا تشرینی یەکەمی ١٩٨٨ تیایدا دەستبەسەر کراوون.

سەربەتاك ئەمانبەن رەنگە شوێنەكە خراپ نەبێت. هەر خۆم وەڵامی خۆم ئەدایەوە سەیر عەقڵەكەیكە، خۆ ئەوانەی لەگەڵ ئێمە بوون لە تۆپزاوا زۆربەیان بەسەیارەی سەربەتاكو بە ئامانە هێنرابوون. ئیتر ئومێدبڕاو دەبووم، هەرچەند بیرم دەكردەوە ئەمووت لەهەر شوێنێك بێت لەژێردەست ئەم زاڵمانە هەر وەك دۆزەخ وایە، تا رۆژێ زووتر بمانكوژن، رۆژێ عەزاب كەمتر دەچێژینو نەجاتمان ئەبێ. بۆ كوێمان ئەبەن، تازە بۆ ئێمە ژیان لە هەر كوێیوایا هەر دۆزەخ بوو. دایكو باوكو پیاوو براو خوشكو كەسوكارت هەموو لێت دابڕێنراون ئیتر لە هەر كوێ بیت ژیان چی تامێكی هەیە. خۆزگەم دەخواست سەعاتێ زووتر بمرم، بەڵام بەزەیم بە منداڵەكانما ئەهاتەوە، ئەمووت باشە ئەگەر من بمرم ئەبێ ئەمان لەژێر دەست ئەم زاڵمانە چیان بەسەر بێت؟ ئاخر لەوەیش ئەترسام ئەگەر بمێنمو منداڵەكانم بەرگەی ئەو برسێتیو تینوێتییە نەگرنو یەكە یەكە بە بەرچاومەوە گیان بسپێرن، چۆن بەرگەی ئازاری مەرگیان بگرم.

پێش چێشتەنگاو گەیشتینە ئەو شوێنە تازەیە، ئێرەیش هەر مەعەسكەر بوو چواردەوری بەتەلی بەرزو دڕكاوی دەورە درابوو، هەروەك ئەوانەی تۆپزاوا كۆمەڵێك قاعەی درێژ درێژ بە دوو ریز بەرانبەر بەیەك دروستكرابوون. ئەوانەی تۆپزاوا تازەتر دیاربوون، بەڵام ئەمانەی ئێرە زۆرن كۆنو پرتو پیستر بوون، هەر لەوە ئەچوو حكومەت دەمێك بووبێت بەكاری نەبردووەو ئێستا بۆ ئەوەی ئێمەی تیا بهێڵنەوە

دەرگاکانیان کردبێتەوە. چونکە زۆر پیس و تۆزاویی بوون، سەریان بە جەمەلۆن گیرابوو، هەر قاعەیەکی چەند گلۆپێکی بۆ دانرابوو لەوە ئەچوو هەر ئەو چەند رۆژەی پێش ئێمە دایان نابێ وایەرەکانی تازە بوون بەسەر دیوارە کۆنەکەوە.

لە سەیارەکان دامانیانبەزاندو سەرلەنوێ ناومانیان نوسی‌و هەر قاعەیەك بە ژمارە پێنج سەت خێزانیان تێئەکرد. ئیتر هەبوون پێشتر پێکەوە بون یان لە ریزەکە بەدوای یەکترییەوە نۆرەیان گرتبوو بۆ ئەوەی هەر پێکەوەبن بەڵام ئەوان هەقیان بەسەر ئەوەوە نەبوو ئەمانە کەسی یەکترن یان نا، لەکوێ ژمارەکە دەگەیشتە پێنج سەت خێزان، ئیتر رەوانەی قاعەیەکی تر دەکران، من لەبەرئەوەی مامان بووم دواتر بۆ قاعەکانی تر بانگیان ئەکردم کە ژن منالی دەبوو، بۆیە هەموو قاعەکانم بینیبوو بەخوا رەنگە ٣٠ قاعە زیاتر بووبێت.[٨٤] بێجگە لە هەندێ خانووی کۆن ئەوەیش هەر حەرەس‌و عەسکەرەکانی تیابوو. ئیتر وەرە حسابکە هەر قاعەی پێنج سەت خێزان بوون بزانە چەنێك ئەکات، ئەوەنە خەڵکەیان هەر لە دوبز گرتبوو، ئیتر حسابکە ئەی تۆپزاوا، ئەی ئەوانەی بران بۆ تکریت، ئەی ئەوانەی رەوانەی نوگرەسەلمان کران، هەموو ئەم شوێنانە پڕ بوون لە ژن‌و منال.

---

[٨٤] - بەپێی ئەو زانیاریانەی نوسەر لە رۆژی ٢٠٠٣/٦/٤ لە (ئەبو ئەیمەن) یەکێك لە سەرپەرشتیارانەی سەربازگەی دوبز وەریگرتووە، سەربازگەکە ٣٤ قاعەی تیابووەو هەموویان بەکاربراوون بۆ زیندانیکردنی ژن و منالە دەستگیرکراوەکان.

ئەو ڕۆژەی ئێمەیان برد هەندێ لە قاعەکان خەڵکی تری لێبوو دوای کە هاتووچۆیانم دەکرد لێم پرسین ئەوان هەفتەیەك پێش ئێمە برابوونە ئەوێ[٨٥]. خەڵك ناوچەی قادرکەرەمو جەباریو قەرەحەسەنو لای کفریو کەلارو دوبزو کوڵەجۆو سەنگاوو قەراخو ئاغجەلەرو بەم دوادواییانە هەتا ناوچەکان لای خەلیفانو ئەو ناوەیشیان هێنابوو بۆ دوبز[٨٦].

هەڵسوکەوتی حەرەسەکان ئێرە خراپ نەبوو باش بوو، باشی چی، وەڵا هەر ئەوەتا لەو سەگێلەی تۆپزاوا باشتر بوون ئەگینا هەزار سوکایەتییان پێمانئەکرد. هەتا ماوەیەکیش خواردنمان هەر سەمونێکی لەوەی تۆپزاوایە. ئێمە وا هەفتەیەك ئەبوو لە ئاوایی نەمابووینو ئەم هەفتەیە تەنها حەوت سەمونە ڕەقمان خوارد بوو، ئێستا ئەگەر ئینسان تێروپڕبێ ڕۆژێ دوانیش نان نەبێ بیخوات تەحەمول ئەکات، بەڵام تۆ وەرە ڕۆژێ نەبێو دوان نەبێ، یەك مانگ لە بیستو چوار سەعاتدا تەنها یەك سەمونێ بخۆیت، چۆن بەرگە دەگریت، وەڵا شەو هەتا بەیانی لەتاو ئازاری ناو سکمان ئەتلاینەوە، ڕەنگو ڕوومان پێوە نەما، بەو هەفتەیە تەواو بە منداڵەکانەوە دەرکەوت بوو کە چەند لەڕو لاواز بوون. ئەوانەی

---

[٨٥] - بەپێی زانیارییەکانی نوسەر کە لە ڕۆژی ٢٠٠٣/٦/٤ لە (ئەبو ئەیمەن) یەکێك لە بەرپرسانی ئەو سەربازگەیەی وەرگرتووە، لە ڕۆژانی ٨و٩و١٠ی مانگی چواری ١٩٨٨، تەنها لەو سێ ڕۆژەدا دە هەزار و سێسەت و بیست و دوو کەس لەو ژن و منداڵانەی لە پرۆسەی ئەنفال دەستگیرکراون لە تۆپزاواوە گواستراونەتەوە سەربازگەی دوبز.

٨٦ - هەمان سەرچاوە ئەوەی خستۆتەڕوو کە لە مانگەکانی کۆتایدا چەند وەجبەیەکی تر ژن و منداڵیان هێناوە خەڵکی ناوچەکانی خەلیفان بوون و هەندێکیشیان سورچی بوون.

حەرەسمان بوون زۆربەیان عارەب حەویجە بوون، رەنگە کوڕو برای ئەوانە بووبێتن کە لە شەستو سێ ساڵ حەرەس قەومییەکە تالآنمانیان کرد. هەندێ عارەب ناو دوبزیشی تیابوو. هەرچەندە سەرەتا هەر وەك تۆپزاوا رۆژی سەمونە رەقێکیان ئەدایە ئەو خەڵکە، بەڵام دوای ماوەیەك رۆژانە چۆرە شۆربایەكو هێلکەیەكو کەمێ ماستیان پێمان ئەدا، زوو زوو سەرئاویان بەو خەڵکە ئەکرد. لە دوبز ئاو زۆر بوو وەك تۆپزاوا نەبوو، ئەمانتوانی دەستنوێژ هەڵگرینو دەستمانکردەوە بە نوێژ، رێگرییان لێمان ناکرد کە نوێژەکە بکەین.

هەروا سێ چوار رۆژێك بوو گەیشتبووینە ئەوێ ئیتر ئەو ژنانەی منداڵ بەر مەمکەیان پێبوو کەوتنە عەزابێترەوە بەهۆی ئەوەی لە شەو و رۆژێکدا هەر سەمونێ رەقیان ئەخوارد، وورد ووردە شیریان کەمیکرد، بەشی ئەوەی ناکرد منداڵەکانیان تێری پێبخۆن. هەر زیرەیان ئەهات لە برساو دایکەی قوڕبەسەریش چی بکات، شیر لەچی دروست بێ، خۆ ئەمە ماڵو حاڵ خۆمان نەبوو ئەگەر شیرەکەیش کەم بکات ئاردەوایە شتێکی بایتێ، هیچ نەبوو، منداڵ گشتی ووردە ووردە وشکبونەوەو لێی کەوتنە مردن.

بەدبەختییەکەی ئێمە هەر لەلایەکەوە نەبوو، خۆزگا هەر برسێتییەکە بووایا نەخۆشی (گەرمە ژەنە)[87] لەناو ئەو منداڵێلە بڵاو بووەوە سەراپای لەشیان بووە قنچکە. ئیتر چونکە گشتیشی چڵکن بوویمانو دە دوانزە

---

٨٧ - لە هەندێ ناوچەی گەرمیان بە نەخۆشی سورێژە دەوترێت گەرمەژەنە

ڕۆژ پێش ئەوەی لە ئاوایش بگیرێین کە هەر ترسەکە پەیابوو بوو کوڵمان نەکردبوو، مناڵ گیانیان ئەخورا، لەو کاتەیا نەخۆشیەکی خراپیش لەناو مناڵەکان بڵاوبوەوە، نازانم پەیوەندی بەو ترسەوە هەبوو کە شەوی کۆتایی مانەوەمان لە تۆپزاوا لە ئێمەیان جیاکردەوە ترسابوون، یان هی ئەوە بوو کە چەند ڕۆژێك بوو گەیشتبووینە دوبز هاتن ناو قاعەکانیان دەرمانڕێژکرد، ئەوان بە حساب وتیان ئەمە بۆ ئەوەیە حەشەراتو مێرو بکوژێت، بەڵام نەخۆشی لەناو مناڵەکان بڵاوکردەوە. کەوتنە سکچوونو ڕشانەوە خەریکبوو دڵو جەرگیان بێتە دەشتەوە. ئیتر بەو حاڵەوەو بەهۆی نەبوونی خواردنو داو دەرمانو پیسی ناو قاعەکانو پیسی برینەکانی لەشیانو بەهۆی گەرمای ناو قاعەکانیشەوە مناڵ لێی کەوتە مردن. چەند ڕۆژێك ئەم سکچونو ڕشانەوەیەیان پێوە بوو، چەند مناڵێ هەر لەناو قاعەکان مردن[88].

ئێ خوایەگیان بەرگەی ئەم هەموو ئازارە چۆن بگرین، وەرە ئەم هەموو دەردە پێکەوە بکە زوخاوێكو بیکە سەر ئەو شاخەیا بزانە ئەیتاوێنێتەوە یان نا، نازانم ئێمە چۆن بەرگەی ئەو هەموو ناخۆشییەمان گرت. وەرە تینوو برسی بە، مناڵت نەخۆش بێ لەلایەك سکی بچێت، بڕشێتەوە، گەرمەژەنەی بێت، گیانی بووبێتە زام، کورە

---

[88] - لەگێڕانەوەی شایەتحاڵەکان و ئەو زانیاریانەی نوسەر لە ماڵی موختارەکەی دوبز و سەردانی مەیدانی بۆ شوێنی ناشتنی مناڵەکان دەستیکەوتووە، تێکڕا لەماوەی مانەوەی دەستگیرکراوەکان لەسەربازگەی دوبز ٢٧٤ مناڵ مردوون.

هەر کرم دای لە لەشیان. چونکە داودەرمان نەبوو، هەر کەوچکە رۆنێ نەبوو پێی چەور بکەیت، هەتا قەباغێکی ئەبەست دەجار لەتاو خوران بەنینۆك هەڵیانئەکەنەوە. چی بکەم هیچ نەبوو لەتاوا بەددانەکانم نینۆکی منداڵەکانم ئەکرد، ئەمووت هیچ نەبێ با ئەوەنە برینەکانی پێنەکولێننەوە. ئازاریان ئەوەنە زۆر بوو دایکیان کوێر بوایاو ئەو رۆژەم نەدبینیایا. ئێستاش کە بیرم ئەکەوێتەوە هۆشم لای خۆم نامێنێ، بەخوا ئێستایش دوای سی ساڵ جاروایە ئەچم گیان منداڵەکان هەڵئەدەمەوە سەیری پێستەکانیان ئەکەم ئەڵێم نەك بووبێتەوە زام.

منداڵ چووزانێ سجن چییە، چوزانێ ئێمە بۆ مردن هێنراوینەتە ئێرە، وا ئەزانێ تۆ دەربەستی نایەی کە ئەو برسییەتی داوای نان ئەکاو تۆ هیچی نادەیتێ. دڵنیام ئەوانیش بیریان لەوە کردۆتەوە ئەم دایکەمان بۆچی لەگەڵمان گۆڕاوە؟ لەناو قوڵایی چاویانە ئەو گلەییەم ئەبینی، ئەی بۆ لە ئاوایی بووین شەو بوایا رۆژبوایا داوای هەرچیمان بکردایا بۆمانی ئەکرد، بۆ هەرکاتێ بمانوتایا دایە برسیمانە یەکسەر هیچ نەبوایا هێلکەو رۆنەکەی حازر بوو، ئەی بۆ ئێستا خەمی ئێمەی نییە، دڵنیام لەدڵ خۆیانەوە ئاوا لۆمەمانیان کردووە. هەرچەندە منداڵ حەزی بەخۆشۆردن نەبوو، بەڵام لە ئاوایی زوو زوو ئاومان گەرم ئەکردو سەرو لەشیانم ئەشۆری‌و پاك‌و تەمیس بوون ئەمووت با ئەسپێ‌و رشك لێتان نەدا، رۆژانە سەریانم ئەدۆزی، لە دویز هەتا یەك دوو مانگێکیش ئەبوو لێرە بووین سابونێ نەبوو لەکوێ بیانشۆین، چڵکن بووین ئەسپێ‌و رشك

لێمانی دابوو بەسەر دەستوپێی منالّەکانا ڕێی ئەکرد، بە سەرو قژیانا ئەهاتە خوارەوە، لەهەق نەداهاتم چی بدۆزم چی بکوژم یەکو دوان نەبوو. ڕەنگە منالّەکان ئەو پرسیارەیان بۆ دروستبووبێ بۆچی لە مالّ خۆمان بەزۆر ئەمانی شۆردو خزمەتمانی ئەکرد، بەلاّم لێرە وازی لێمان هێناوە. هیچیان ناووت بەلاّم دلّنیابووم واهەستیان کردبێ من دەربەستیان نایەم بۆیە وەك جاران زو زوو کولّیان ناکەمو سەریان نادۆزم، یان وەك جاران بەدەم هاواریانەوە ناچم. ئەوان ئەوەیان نازانی دایکیان هەموو سەعاتێ لەگەلّ هەر هاوارو نزایەکی ئەواندا قرچە لەجەرگییەوە دێ. لە شوێنو ڕێی خۆمان یەکیان تایەکی هەبوایا هەتا بەیانی بەدەورییەوە دائەنیشتینو بە پەڕۆی تەڕ ساردمان ئەکردەوە، لێرە وەك نەمامێك وا یەکە یەکە بەبەرچاوتەوە وشك ئەبنو هیچ دەسەلاّتێکیشت نییە.

هەر ئەوەنەت ئەزانی قیژەیەك هاوارێك لەولاتەوە بەرز ئەبووەوەو دایکێك ئەیدایە بەسەروچاو خۆیا منالّەکەم مرد، دەبوو لە پەنجەرەکەوە بانگ لە حەرەسەکان بکەین وەرن منالّمان مردووە، منالّ مردن هەر بەدەم ئاسانە، ئیتر دووان ئەهاتن ئەیانبردە دەرەوەو نەمانئەزانی چی لێدەکەن. وەرە منالّ بەو بەدبەختییە گەورە بکەو ئەوانیش ئاوا بە دەرمان بوونە هۆی مردنیان. دایکەکانیان خەریکبوو کوێر دەبوون ئەوەنە چەپۆکیان دابووە ناو چەوان خۆیانداو شیوەنیان بۆ دەکرد. بۆ ئێمەیش وەك ئەو دایکانەی منالّیان مردبوو هەر بە ئازار بوو، چونکە

هەریەکەیان جەرگسوتان خۆی بیر دەکەوتەوە یان ئەوە دەهاتە پێشچاوی کە ئەمڕۆ منالّی یەکێکی تر مردووە سبەی‌و دووەی منالّی ئێمەیش بەو دەردەیش نەبێت هەر لە برسا دەمرن. من خۆم چونکە جەرگم سوتابوو منالّم بەباوشمەوە روحی دەرچوو بوو دەمزانی ئێستا جەرگی ئەو ژنانە چۆنە بۆ مەرگی منالّەکانیان، لەناو سجن‌و لە رەزالەتدا منالّت بمرێ، لە مردنەکەیش ناخۆشتر ئەوە بوو کە جەنازەکەیان ئەبردە دەشتەوە ئیتر نەمانئەزانی چی لێدەکەن، دەینێژن، قەبری بۆ ئەکەن نایکەن، کەسێ دلّسۆز خۆت نەبێ لەکوێ دەربەست تەرمی منالّی ئێمە دێت، ئەوان هەموو عارەب بوون خوا ئەزانێ کێ نالّێت خوا خوایان نەبووە هەمووماﻥ بمرین، لەکوێ بەزەییان بەمنالّ ئێمەیا ئەهاتەوە. ئەوان لە تۆپزاوا جیایانکردنەوە بۆ چیان بوو، هەر بۆ کوشتنیان بووە ئیتر لە کوێ دەربەست دێن منالّمان چۆن ئەنێژرێت، رەنگە هەروا چالّێکیان کردبێ‌و کەمێ خۆلّیان کردبێتە سەریا تا سەگ‌و چەقەلّ دەری نەهێنن. خوایە گیان وەرە ئەو هەموو زولّمەت لێبکەن‌و بەو حالّەوە بیشمریت‌و نەزانرێت قەبرت لەکوێیە؟

هەر ماوەی جارێکیش چەند کاروانێ تریان ئەهێناو هەروا ئەیانکردە قاعەکانەوە[٨٩]، هەموو ئەوانەی پێش ئێمە لەوێ بوون‌و ئەوانەشی دوای

[٨٩] - بەپێی قۆناغەکانی ئەنفال بەشی زۆری خێزانە دەستگیرکراوەکان بەیەك پرۆسەدا تێپەڕیوون، براونەتە تۆپزاوا و لەوێوە جیاکراونەتەوە، بەشی زۆری ژن و منالّ نێردراون بۆ سەربازگەی دوبز. دوا کۆمەلّە خەلکیش نێردرابنە ئەم سەربازگەیە، خەلکی ناوچەکانی خەلیفان بوونە.

ئێمه هێنرانه ئەوێ، هەموومان هەر ژنو مناڵ بووین، نه زەلامو نه پیرێژنمان لەگەڵ نەبوو. که له تۆپزاوا بەپێی تەمەن جیا دەکرانەوە دیاربوو شوێنی هەر یەکێکیان جیابوو، ئێمەیان ناردبووه دوبز، دوای ئەو شەش مانگه ئەوکات زانیمان پیرێژنو پیرەمێردەکانو هەندێ ژنو منالّیان ناردووه بۆ نوگرەسەلمان، بەخوا ئەوساو ئێستاش هەر نەمانزانی پیاوه گەنجەکانیان له کوێ سجنکردووه، ئیتر نازانم هەر جێوەجێ ئەوانیان بردبوو خرابوونەژێر خۆڵەوە، نەمانزانی خرانه شەتەوە، دایانه دەم ئاگرەوە، چیان لێیانکرد مەگەر هەر خوا بزانێ.

له تۆپزاوا کۆمەڵێك کەنیشکی جوانو جاحێڵیشیان هەر جیاوەکردو کردبویانیانه قاعەی جیاوازەوه تائێستا هەواڵێ ئەوانیش نەبوو، ئەوه هەندێ له زەلامەکان دۆزریانۆ له گۆڕەبەکۆمەڵەکان، بەلاّم کچەکان هەر ئاسەواریان نەبوو.

یەکێك له حەرەسەکان تورکمان کەرکوك بوو ناوی (هادی) بوو، کوردی ئەزانی، ئەو پیاوێ گەلێ باش بوو، دیار بوو بەزەیی پێمانا ئەهاتەوە، قسەی لەگەڵمان ئەکردو دڵمانی ئەدایەوەو ئەیووت خوا کەریمه ئیشەڵا خوا رەحمتان پێدەکات بۆمان ئەپاڕایەوە. بەهۆی ئەوەوه زانیمان تەرمی ئەو منالاّنەی ئەمرن هەر له سیمەکه فڕێ ئەدرێنه ئەو دویوو سیمەکەوه، ئیتر هەر بەجارێ هارو شێت بووین. خوایه گیان ئەو منالاّنه گوناحیان چییه ئاوایان پێبکرێت، تینوو برسی بکرێن هەتا ئەمرنو که مردیشن تەسلیم به خاك نەکرێنو هەر فڕێبدرێنه دەشتەوەی

تەلبەندەکە، هەر سەگ ئەیانخوات. کورە گەلیٚ زەحمەتە گێڕانەوەی هەر بەدەم ئاسانە. ئیتر قسەکە بەناو قاعەکانا بلاو بوویەوە کە جەنازەی منالەکان فڕیٚ ئەدریٚ، ڕۆژانەیش منالی دوان هەر ئەمرد لەتاوا دایکەکەی تەرمەکەی نادایە حەرەسەکان، لەناو قاعەکانیش چونکە سەری بە چینکۆ گیرابوو دنیایش گەرمی کردبوو تەرمەکان هەر زوو بۆنی ئەکرد. دیار بوو لەناو حەرەسەکانیش پیاو باشی تیابووەو رەحمی خوا لەدلیان هەبوو، لەگەلٚ ئەو کاك هادییە کەوتبوونە مشوری ئەوەی چارەسەر بۆ جەنازەی منالەکان بدۆزنەوە، جوابیان بۆ موختارەکەی دوبز ناردبوو کە حالێکی وا هەیە. ئیتر مالی ئاوابێت هاتبوو ئەو تەرمانەی فڕێدرابوون بردبوویە مالٚ خۆیان شۆردبوویی‌و کفنی کردبوون‌و ناشتبووی. لەوەو بەدوایش کە هەر منالێك بمردایا حەرەسەکان یان ئەیانبردە مزگەوتەکە دایانئەناو جوابیان بۆ موختارەکە ئەنارد، یان هەر ئەیانبرد بۆ مالی موختارەکە، ڕۆژ وابوو هەر لەو قاعەیەی ئێمە چوار منالٚ پێنج منالٚ پێکەوە مردوون، ڕۆژ بووە بیست تەرمی منالیان پێکەوە بردووە بۆ مالی موختارەکەو ئەوان کفنیان کردوون‌و تەسلیمیان کردووە[٩٠].

مەینەتی زۆرمان بەسەردا هات، کە گیران ژن هەبوو دوگیان بوون، من خۆم زگم بەو کەنیشکەم پڕ بوو. هەبوو مانگ خۆی بوو، لەو ڕێوبانانە

---

[٩٠] - لە چاوپێکەوتنی نوسەر لە ٢٠٠٣/٤/١١ لەگەلٚ رەحیمە بەهادین خێزانی موختارەکەی دوبز، ئەوەی ئاشکراکردووە کە خەلك و سەربازەکانیش تەرمی منالیان بردووەتە مالیان، ئەمان شۆردویانە و کفنیانکردوون‌و لە سێ شوێنی جیاواز بەخاکیان سپاردوون.

ژن بووه هەر لەناو سەیارە منالّی بووە. ئێمە کە براینە دوبز هەروا دە رۆژێك بوو لەوێ بووین براژنەکەم منالّی بوو، ئەوەنە زالّم بوون لەتە موسێکیان نەئەدا پێمان تا ناوك منالّەکەی پێببڕین، بەخوا بەبەرد ناوك منالّەکەیم بڕی، شوکر بۆ خوا لەژیانا مایەوەو ئێستاش هەر ماوە گەورە بووە. منالّ زۆر لە زیندان لەدایکبوون بەلاّم زۆربەیان ئەمردن. کە گیراین ئەوەی دەمێك بوو دووگیان بوو لە جێوڕێی خۆمان خواردن باش بوو دایکەکە بەگوڕتر بوو، منالّەکەیشی هەراش بوو بە پوختی لەدایکئەبوو. بەلاّم دوای لەدایکبوون ئیتر بەهۆی کەمی شیری دایکەوە برسی ئەبوون‌و ناو قاعەکەیش هاوین بوو گەرم بوو بەو هۆیەوە نەخۆش ئەکەوتن‌و زۆرێکیان مردن، تاك‌و تەرا ئەو منالاّنە رزگاریان بوو. ئەوانەیشی تازە دووگیان بوون‌و کە گیراین تەمەنی دووگیانیەکەیان سێ چوار مانگێ بوو ئەوانیش بەهۆی ئەوەی ئەو ماوەیەی تر هەتا کاتی لەدایکبوونی منالّەکە خواردن نەبوو دایکەکەی برسی‌و نەخۆش بوو، منالّەکان تەواو نەبوون، ئەو چەند مانگەیش بەو ترس‌و دلّەڕاوکێیەو بە تینوێتی‌و برسێتی هێنابوومان، منالّەکانیش پێیانەوە دیار بوو کە لەدایکئەبوون هەروا بەقەدەر لەپی دەستێ بوون.

ماوەی نزیك شەش مانگ‌و نیم لە دوبز ماینەوە[٩١] لەو ماوەیە منالّی زۆر لەدایکبوون‌و من ناوکی هەموویانم بە بەرد بڕیووە. کە ئەچووینە دەشتەوە بۆ سەر ئاو هەر بەردێکم ببینیایا دەمەکەی تیژ بوو لەگەلّ

---

[٩١] - لە ١٩٨٨/٤/١٥ هەتا ١٩٨٨/١٠/٢٥ لە سەربازگەی دوبز بە زیندانیکراویی ماونەتەوە.

خۆم ئەمهێنایە ژورەوەو ساوێیبوومە یەکتریا دەمەکەیانم باریك‌و تیژ کردبوو، ئیتر لە هەر قاعەیە ژنێ بکەوتایەتە ژانی منداڵ بوون بانگی حەرەسەکانیان ئەکرد وا ژنێك منداڵی ئەبێت، ئەوانیش ئەهاتن بە شوێن مناو هەر بە زمان ژنەیلەکەوە ئەیانکردە هەرا (هەرمێ مامان) دەبوو من بچم بەدیارییەوە بم هەتا منداڵەکەی دەبوو، ناوکیم بەو بەردە ئەبڕی.

ئیتر وەزعێکمان بوو گاورت پێ موسڵمان ئەبوو، کەچی ئەوانە لای خۆی خۆیان موسڵمان بوون گاڵتەیان پێمان ئەکرد، هەنێکیان هەبوون ئەهاتن لە پەنجەرەکانەوە سەیریان ئەکرد، خۆزگەمان بە مردن ئەخواست، بەڵام دەسەڵات چی بوو نە ئەمردین‌و نە لەدەست ئەوانیش نەجاتمان ئەبوو. وەرە ژن بەو حاڵەوە منداڵی ببێ هەر پەڕۆ شڕەیەك نەبوو خوێنەکەی گیانی بسڕیتەوە، منداڵەکە پاککەیتەوە، خواردنێ نەبوو بیدەیتە دایکەکە، وەزعێکمان بوو باوەڕناکەم لە قیامەتیش خوا دڵی بێت لە دۆزەخا وا لەخەڵك بکات. بەڵام نازانم ئەمانە چی بوون وا ئەوەنە زاڵم بوون.

بە ژمارە نازانم بەڵام منداڵ زۆر لەدایکبوون، هەبوو هەر جێوەجێ ئەمردن، هەبوو چەند رۆژێ ئەژیان‌و هەیشبوون خوا پاراستیانی‌و مانەوە.

هەر ئەوە نەبوو ئەو منالە تازە لەدایك بووانە بمرن، منالّی تریش زۆری مردن  هەراش بوون،[92] نەخۆشی زۆر بلاّو دەبووەوە لەناوماندا نە دەرمان هەبوو نە دکتۆرێك، خواردن نەبوو، پیس‌و چلّکن بووین، ئەسپێ‌و رشك لێمانیدابوو، حەشەرات‌و مێرو لەناو قاعەکە زۆر بوون. منالّ بەهۆی چلّکنییەوە گیانیان ئەخورا نازانم ئەویش نەخۆشی بوو یان بەهۆی ئەوەوەبوو ئەوەنە خورانبوویان سەراپای لەشیان بوو بووە زام‌و خوێنیان لێدەتکا.

کەس نەبوو منالّێك‌و دوانی نەخۆش نەبێ، کەس نەبوو ترسی ئەوەی نەبێت ها ئەمڕۆ ها سبەی بەسەر دەستییەوە رۆحی منالّێکی دەرناچێت. تۆ وەرە بەو ترس‌و لەرزەوە پێنج شەش مانگ پێنج سەت کەس بکەیتە هەر قاعەیەکەوە بەو گەرمای هاوینە، تینوو برسیان بکەیت چۆن نەخۆش ناکەون؟ منالّ گشتی وشکەوە بووبوون هەر ئەوەتا روحیان تیا مابوو، بەخوا منالّ وابووی تەنها پێستکەو ئێسقانەکانی مابوون هەموو بووبوونە قالۆرە ئەوەنە رەق‌و وشك بوو بوونەوە. ئێ کاکە هیچ نەبوو بیخۆن ئەوەی شیرەخۆرە بوو دایکەکەی بایی ئەوە شیری تیا نەبوو منالّەکە تێری پێبخوات، ئەوەشی شیرەخۆرە نەبوو هەراش بوون، نانەکە نەبوو بیخۆن.

---

٩٢ - بەپێی ئەو زانیاریانەی نوسەر لە ٢٠٠٣/٦/٤ لە یەکێك لە سەرپەرشتیارانی زیندانەکەی وەرگرتووە لە منالّی یەك رۆژەوە تا منالّی تەمەن ٧ بۆ ٨ سالّ لەناو مردووەکان هەبوون.

نزیك مانگێك ئەبوو لەوێ بووین منالّ هەر خەریكبوو گەڕوگول ئەبوون، خۆمان چلّكن‌و سەرو قژ شێواو، ڕەنگ‌و ڕوومان نەمابوو خەلّك بمانی بینیایا لێمان ئەترسا، نازانم چۆن بوو یەك دوانێ لە ئاودەستەكانیان دەستكاری كردو كردیانە سەرشۆرك بۆمان‌و ئیتر بە نۆرە ڕێگەیان ئەدا خۆمان‌و منالّەكان بشۆرین، دوو قل سابونیان لە سەرشۆركەكە دانابوو، هەر جاری دوو ژن بە منالّەكانییەوە دەچوون‌و دوو عەسكەریش لە نزیك قاپیەكەی حەرەس دەبوون هەتا دەهاتنە دەشتەوەو ئیتر دەبوو دوانی تر بڕۆن. بەم شێوەیە بە چەند ڕۆژێ هەموو كولێكمان كردو جلوبەرگەكانمان كەمێك پاككردەوەو هەناسەیەكمان هاتەوە بەر. هەر ئەو ماوەیەیش بوو ئیتر بێجگە لە سەمونەكە خواردنەكەیشمان تۆزێ باشتر بوو. بەلاّم ئەو مانگەی هەر سەمونە ڕەقەكەیان پێمان ئەدا منالّ لێوو ناو مەلاژووی هەمووی بووبووە برین، سەمونەكەیان پێ ناخورا، هەندێجار نەیانئەهێشت وردی بكەین بۆیان ئەیانكردە سەمونە ڕەقەكەیاو ئەیانووت ئاوا ئەیخۆین، بەخوا ئەو نەهرۆیەی كوڕم دایكی بمرێت ئەو ڕۆژەی ڕوحی دەرچوو ئەوەنە قەپی بە سەمونەكەیا كردبوو دەم‌و مەلاژویشی برین بوو نیوەی سەمونەكە بوو بووە خوێن، كە مردیش سەمونە خوێناویەكەیشم لەگەلّ خۆم هێنابووە هەتا ماوەیەكیش لە ژوورەكە هەلّمواسیبوو، هەموو ڕۆژێ تاوێ بەدیار ئەو سەمونە خوێناویەوە ئەگریام.

هەرچەندە بەم دووادوایە باشتر بوو هەندێجار بەیانیان نەفەری هێلکەیە کوڵاویان لەگەڵ سەمونەکەیا پێمانئەدا، نیوەڕوانیش وەك (قزعەی عەسکەری) شۆربایەك و هەنێ برنجیان تێکەڵ ئەکرد ئەیانداپە ئەو خەڵکە. بەڵام لەپاش چی، ئەو خەڵکە برسێتی تەواو پەکیخستبوو، رەنگە دوو سەت سێ سەت منالّ لە برسا مردبێ[٩٢]، تازە شۆربا روح ناخاتەوە بەر مردوەکان.

ئێستا زۆرجار کە بە تەنها ئەبم و منالّەیل لە دەورم نەبن یان کە ئەچینەوە بۆ ئاوایی بیر لەو رۆژگارانە ئەکەمەوە، بەلامەوە سەیرە کە ماوینەتەوە تا ئێستاو بەرگەی ئەو هەموو ئازارانەمان گرت، وەك لە تینواو لە برساو بە نەخۆشی نەمردین، ئەی ئەو هەموو خەفەتو مەراقە چۆن نەمانی کوشت. خۆم ئەڵێم تاکە ئومێدێك لەژیانا مابوومان ئەوە بوو سەدام بڕوخێو هەواڵ براو باوك منالّو کەسوکارمان دەستکەوێتەوە، رەنگە ئەو چاوەڕوانییە ئێمەی هێشتبێتەوە. ئێ لەو کاتەیشەوە سەدام روخیاوە ئێمە هەر بە چاوەڕوانی دۆزینەوەی ئێسكو پروسکی ئازیزەکانمانەوەین، لەوە ئەچێ خوا وەك لەسەر ئەو هەموو غەدرەی تر لێمان بەجواب نەهات، بەزەیی پێمانا

---

[٩٢] - بەپێی زانیاری نوسەر لە دەرئەنجامی ئەو چاوپێکەوتنانەی لەگەڵ ئەو ژنانەی لەو سەربازگەیە زیندانی کرابوون، هەروەها چاوپێکەوتنی لەگەڵ خێزان و منالّەکانی مام ئەحمەد موختاری دوبز، هەروەها ئەو زانیاریانەی لە یەکێك لەسەرپەرشتیارانی زیندانەکەی وەرگرتووە، ٢٧٤ منالّ مردوون.

هاتبێتەوەهێشتبێتمانییەوە تا هیچ نەبێ ئەو مەرازەمان حاسڵ بێو رووفاتی کەسوکارەکەمان بدۆزرێتەوە ئەوسا بمرین.

ئەوە چەند ساڵە ئەنفالەکە بوویە هەر لە یەکەم رۆژەوە لە هەردەکەی لای ئاوایی نزیك جادەکەی قادرکەرەم کە محەمەدو براکانم جیاکریانەوەو براوون تا ئێستا هەموو رۆژێك هەر وان بە بەرچاومەوە، شەویش کە سەر ئەخەینە سەر سەرین ئەوەنە بە خەیاڵیانەوەین دێنە خەوم، بانگم ئەکەن، داوای نانو ئاو ئەکەن. جاروایە ئەیانبینم هیلاكو ریش هاتوون وا ئەزانم هێشتا هەر لە سجندان، جار وایە دێنە خەوم لەناو گوڵو گوڵزارو سەوزی بەهاردان. نەك من مناڵەکانیش زۆر جار ئەڵێن دایە خەومان بە باوکمانەوە بینیووە، یان ئەڵێن ئەمشەو لە خەوما بابامانم بینی ریشێ سپی جوانی هەبوو جلێ سپی لەبەری بوو، ئینجا ئیستا باشە گەورە بوونو هەموو شتێك ئەزانن، ئەوکاتەی لە دوبز بووین مناڵ بوون نازانم خەویان ئەبینی چی بوو نیووە شەو ئەیانکردە هاتوهاوار ئەچم بۆ لای باوکم بانگم ئەکات. عەبدولڕەحمان کوڕە ناونجییەکەم لەو سجنە ماوەیەك وەك شێتی لێهاتبوو شەوان خەبەری ئەبووەوە ئەیووت ئەوە باوکمە لەو دیوو پەنجەرەکەوە خۆم بینیم نان و ئاوی بۆمان هێنابوو. ئیتر شەوێك دووان نەبوو دەیانجار ئەو مناڵانە لە شیرین خەوا منیان خەبەر کردۆتەوە باسی باوکیان ئەکرد، دیار بوو ئەهاتە خەویان. کوێریم یاخوا ئەی ئەبێ چەند شەو باوکیشیان خەوی بە مناڵەکانەوە بینی بێت.

ئەوەنە لەبەر خۆمانەوە ئەمانلاوانەوە ئەبێ ئێستا باوکتان حاڵی چۆن بێ، خاڵۆکانتان، باباتان، دایکو باوکم ئەبێ ئەوانیش وەك ئێمە برسیان بێ؟ ئەو منالانە دەیانجار کە سەمونە رەقەکەیان ئەدا پێمان هەرچەندە خۆیان لەبرسا خەریکبوو ئەمردن، سەمونەکەیان ئەخستە بەر باخەڵیان ئەیانووت هەڵیئەگرین بۆ باوکمان، شەو دێ بۆ لامان ئەیدەینێ.

هەرچەندە دوو کچەکەی ساڵح برامو کچەکەی بورهان شوبرام هەراشتر بوون، بەڵام ئەوانیش شەو رۆژ هەر ناو دایکو باوکیان لەسەر زمانیان بوو، بەو حاڵەی خۆمەوە خەریکبوو دڵم دەرئەچوو بۆ نەجیبەو گوڵەباخ کچەکان ئامین برازێم، بیری دایکو باوکو خوشکو براکەیان ئەکرد، دەیانجار منیشیان خستۆتە گریان بۆ دوو خوشکەکەی تریانو شوانەی برایان، ئەوانەی من بەس نەبێ خۆم لەگەڵیان بووم، ئەو بەدبەختانە وەك باوکیان بەو حاڵە گیرا، دایکەکەیشیان لە تۆپزاوا لێیان جیاکرایەوە، هەر شێت بووین لەتاوا لەو دوبزە. منالەکان شەو رۆژ ئاوها جەرگمیان ئەکردە ئاو، لەتاوا ئەگریام هەناسەم لەبەر ئەبڕا، ئینجا ئەکەوتنە سەر دەستو پێمانا توخوا دایە مەمرە، ئەی ئێمە چی بکەین ئەگەر تۆ بمریت. خۆ نەمئەوێرا بڵێم دە ئێوەیش ئەوەنە باس باوکتان مەکەن.

لەوێ ئەو حاڵەی خۆمم ئەبینی کە خەریکە روحم دەرئەچێ بۆ منالەکانم ئەوجا بیرم ئەکردەوە باشە ئەبێ ئێستا دایکم لەکوێ بێتو ئەبێ حاڵی

چۆن بێت بۆ ئێمە، بۆ کچەکانی، بۆ کوڕەکانی خۆ ئێمەیش جەرگ ئەو بووین هەریەکەو کەوتینەتە شوێنێکەوە، مەگەر هەر لە خەویا ئێمە پێکەوە ببینێتەوە. بەس نەبێت من هەموو مناڵەکان لەسەر دەستو پێی خۆم بوون، شەوان لە تەنیشت خۆمەوە رائەکشان. چەندێ خەفەتو مەراقم لە خۆمو منالەکانو باوکیانو خوشكو خوشکەزاو براو برازا خواردووە، دوو ئەوەندە بۆ دایکم هەڵقرچاوم. لە دنیایا کەس وەك ئێمەی بەسەر نەهاتووە، درۆیە بەخوا درۆیە ئەگەر بڵێن لە هیچ شوێنێ قەومێتر وەك ئەم کوردەی بەسەر هاتووە، کەس لە کورد مەزلومتر نییە لەدنیایا.

ئا بابیرم نەچێت هەر لە دوای یەکەم مانگەوە برابووینە دوبز دوای ئەوەی ماوەیەك بوو لەوێ بووین ئیتر هەر جارناجارێ ئەهاتن کۆمەڵێك مونشەئەیان لەو ژنو منالێلەی لەوێ بووین پڕئەکردو ئەیانیانبرد، درۆم نەکردبێ هەشت مونشەئە بوون بەدوای یەکەوە ئەوێستانو ئەو رۆژە سێ کاروان بەو شێوەیە بە دوای یەکا بار ئەکریاو ئیتر هەتا ماوەیەکی پێئەچوو نەئەهاتنەوە، خۆ کەس نەیئەزانی بۆ کوێیان ئەبەن[٩٤] لەو کاك هادییەمان ئەپرسی، یەك دووانێ تر هەبوون خەڵك حەویجە بوون یەکیان ناوی محەمەد بوو ئەویش پیاوێ باش بوو لەوەکانتر باشتر بوون

---

[٩٤] - بەپێی ئەو زانیاریانەی نوسەر لە ٢٠٠٣/٦/٤ لە (ئەبو ئەیمەن) یەکێك لە سەرپەرشتیارانی سەربازگەی دوبزی وەرگرتووە پێنج وەجبە ژن و منال لە سەربازگەی دوبز لەژێر چاودێری دایرەی ئەمن گوێزراونەتەوەو نازاندرێ بۆ کوێ براون.

لەگەڵمان لەوانیشمان ئەپرسی ئەم خەڵکێلە بۆ کوێ ئەبەن؟ هەر ئەیانووت بەخوا نازانین، ئێمە هەر ئەوەنە دەزانین ئەو رەتڵە سەیارەیە دێن و دەبێ ئێمە پڕی بکەین و بینێرین، کەسی ئێمە لێرە لەگەڵیان ناڕوات،. لێیانمان ئەپرسی ئەبێ نەیانبەن بۆ موجەمەع بۆ ناو کەسوکاریان، هەر ئەیانووت نازانین.

خۆیشمان یەکەمجار کە کاروانێکیان برد دڵمان خۆش بوو ئیشەڵا بەرمانئەدەن و ئەو وەجبەیە خۆیان و شانسیان بەر یەکەم کاروان کەوتن ئەیانبەنەوە بۆ ناو کەسوکاریان. ئەشمانووت بەخوا ئێستا کە ئەمانە ئەڕۆنەوە بەناو خزم و کەسوکارا هەواڵ بڵاوئەبێتەوە ئێمەیش لێرەین، خزم و کەس دێن بەهەواڵمانەوەو هەرچۆنێك بێت خۆیانمان پێئەگەیەنن. چەند شەوێك بەو ئاواتەوە رۆژمان ئەکردەوە کە بەیانی کەسوکارمان پەیا ئەبن. بەڵام چەند رۆژێك تێپەڕی و کەس بەلامانا نەهات ئیتر گومانی ئەوەمان بۆ دروستبوو کە ئەوانەی برابوون بەرنەدراوون، ئەگینا یەکێ هەر ئەهات بە هاوار کەسوکارەکەیەوە لێرە. دوای بیرمان ئەکردەوە باشە ئەگەر بۆ ئەوەبووایا بەریان بدەن خۆ دەبوو هەر سەیارەیەك خەڵکی یەك ناوچەی تێبکەن و هەموویان بەو سەیارەیە بەرێتەوە بۆ ئەو شوێنەی وا کەسوکارەکەیانی لێیە، ئەو سەیارەی وا بووی خێزانێ دووان لای قادرکەرەم و جەواری و چوار کەلارو دوان ناوشوان و ئاغجەلەرو لای تەقتەق و سەنگاوو ئیتر هەمووی تێکەڵ بوو، دەبوو خۆمان هەر بەوەیا بمانزانیایا بۆ بەردانیان نییە. بەڵام ئەیشمانووت قابیلە ئەگەر بیانەوێ

ئەو خەڵکەیش بکوژن ئێمە وا زەلیل لە بەردەستیانا کەوتووین لەچی ئەترسن ئەگەر هەر لێرە بمانکوژن، یان خۆ ئەیانتوانی وەك چۆن دەرمانیان کردە قاعەکانەوەو منداڵ دنیای کوشت، ئاوا قلە دەرمانێ بکەنە بان ئێمەیشا یان بیکەنە ناو ئاوو سەمونەکەوەو خۆمان ئەمردین، ئیتر بۆ ئەبێ بمانبەن لەشوێنێتر بمانکوژن؟

ئەو شەش مانگو نیمەی لەوێ ماینەوە چەند جارێك ئاوا کاروانێکیان بردووە. ئەوە شتێ منداڵەکانیشم هەر لەبیرەو تائێستاش هەر خەفەتی پێدەخەووم، ئەوەنە کلۆڵو بەدبەخت بوو بەردەوام شتێ ئەبوو کە ئیتر ببێتە مەراقی منداڵەکان، لەناو ئەو سجنە تۆ چەند مانگ هەر پێکەوەبن ئەگەر پێشتر یەکتریشتان نەبینیبێت لەوێ تێکەڵ دەبن، منداڵەکانیش هەرچەند هەمووی هەر نەخۆش‌و زەلیل بوون بەڵام هیچ شتێ نەبوو هەر سەعاتێ خۆیانی پێ بخافڵێنن لە پەنجەرەکەوە دەرەوەیان ئەبینی‌و دەگریان بۆ دەشتەوە بەڵام دەرگای قاعە کلۆم درياوە چۆن بچنە دەشتەوە، لەناو قاعەکە هۆگر یەکتری دەبوون‌و بەو حاڵەیانەوە جار جار پێکەوە یارییان دەکرد، کە هەر وەجبەیەك بەر دەکەوت ئەیانبرد ئیتر ئێمە چەنێ خەفەت‌و مەراقمان هەبووە وا یەکە یەکە لێرەیش لەگەڵ ئەو ژنێلە جیامان ئەکەنەوە، منداڵەکان دە ئەوەنەی ئێمە بۆ هاورێکانیان ئەگریان. چوار منداڵ پێکەوە بەم رۆژگارە سەریان ئەکردە یەکەوە، لە پڕ یەك دوانێکیان لێیان دائەبڕا ئیتر دیار بوو ئەوانیش خەفەتیان بۆی دەخواردو ئەگریان‌و داوایانئەکرد یان پرسیاریان ئەکرد

بۆ کوێ چوون؟ کەی دێنەوە؟ دەبوو هەر هەڵیانبخەڵەتێنین‌و بڵێین چەند ڕۆژێ تر دێنەوە، یان دەمانووت ئەوانیان بردووە بۆ شوێنێکی ترو دوایی مونشەئەکان دێن‌و ئێمەیش دەبەن بۆ لای ئەوان. ئەوانەی بەو وەجبانە بران ئێستاو ئەوساش کەس نەیزانی چیان لێیانکرد. چونکە ئێمە بەشێك لەوانەمان ئەناسی‌و کە هاتینەوە کەوتینە هەواڵ پرسین‌و سۆراخیان، کەچی کەس هیچی لە بارەیانەوە نەئەزانی. ڕۆژانە خەڵکیش هەبوو بۆ سەروسۆراخ کەسوکارەکەی کە وەك ئێمە لە سجن بوون ئەهاتن بۆلامان پرسیاری کەسوکاریان ئەکرد، ئیتر زانیمان ئەوانەی بە وەجبەو مانگی جارێك ئەیانیان گواستەوە کەسی نەگەڕاوەتەوە بۆ کوردستان، لە کوێن بەخوا مەگەر هەر خواو سەدام بزانن.

منیش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بار لەشم گرانتر دەبوو ئەزانم ئیتر منداڵەکەم وا وردە وردە گەورە ئەبێ‌و لەگەڵ ئەوەیشا نەخۆشی منداڵەکان هەر بەردەوام بوو یەکیان چاك دەبوو یەکێ تریان ئەیگرد، بەڵام نەهرۆ کوڕە بچکۆلەکەم دایکی کوێربێ بەخوا هەر لەو شەوەی تۆپزاواوە ئیتر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کز ئەبوو نازانم زراوی تەقی نازانم لە ترسا چی لێهات ئەو شەش مانگەو هەتا ئەو ڕۆژەی گیانی دەرچوو هەر ئەکرۆزایەوە، تازەیش زمانی گرتبوو هێشتا هەموو قسەیەکیشی دەرنەدەبڕی کەچی داوای خەیاری دەکرد، ئێمە وا شەش مانگ بوو لە سجن بووین ئەوکاتەیشی گیراین ئەو عومری هەروا دەچووە ناو ساڵ‌و نیوێکەوە باوەڕ ناکەم خەیاری هەر بینیبێت نەمزانی چۆن وا کەوتبووە

سەردەمی، نازانم گوێی لە منالٚ لە خۆی هەراشتر بوو بوو وڕکیان لە خەیار گرتبووو یان هەر خوا نابووی لەدلٚیو خستبوویە سەر زمانی، بەخوا ئەوکاتەی بەسەر دەستمەوە روحی دەرچوو هەر ئەیووت خەیار. لەو کاتەوە چی چەنێ سەیارەی سەوزە و مێوە فرۆش بەم کۆلانەیا رۆیشتبێو خەیاری فرۆشتبێ من دیمەنی گیاندانەکەی نەمرۆ هاتۆتەوە بەرچاوم، چووبێتمە ئەو بازاڕە لە دوکانو سەر عارەبانەکان خەیارم بینیبێت وەك ئەوەی بریسکەیەك لە دلٚمی دابێ ئاوا رامیچلٚەکاندووە. لەو کاتەوە خەیار بەم مالٚەی ئێمە نەهاتووەو نەچۆتە سەر زمانم. هیچ نەبوو بیدەیتێ کوێرایم دایا هەر سەمونە رەقەکە بوو دابوومە دەستیەوە ئەمووت ئەوە خەیارە، ئەوەنە بردبوویە دەمێوەو قەپی پیا ئەکرد پوکو ناو مەلاژوێشی هەمووی بوو بووە زام نیوەی سەمونەکە بوو بووە خوێن، ئەوە هەموو خزمەکان ئەزانن چونکە لەتاوا سەمونەکەم بە پەتێك لە ژویرەکەمان هەلٚواسیبوو بەدیارییەوە ئەگیرام، بەخوا وابزانم مانگێ ئەگەر چل شەو دوای ئەوەی بەر لێبوردنەکە کەوتبووینو گەڕابووینەوە میمکێکی بە زۆر لە پەتەکەی کردەوە وتیان هەر شێتیش ئەبیت بەدیارییەوە، بردیان هەر نەمزانی خستیانە ژێر خۆلٚەوە فڕێیاندا، نەمزانی چیان لێکرد.

وا ئەزانم چووبوینە ناو مانگی نۆوە منالٚەکەم بوو، چونکە کە هاتینەوە هێشتا چلەی نەچوو بوو. هەرچەندە لە دەفتەر نفوسەکەی کە چەند سالێ دواتر بۆیمان دەرکرد نوسیویانە (١٩٨٨/٧/١) بەلاٚم ئەزانم

درەنگتر لەدایکبوو. منالّ چی بەخوا کەس باوەڕی ناکرد بمێنێ ئەوەنەی تۆزێك بوو، بەلاّم چوونکە خوا ڕۆژی تەواو نەکردبووە شوکر بۆ خوا ئێستا مالّو منالّدارەو خویندنی تەواو کردو بۆتە مامۆستا دەرس ئەلێتەوە. ئەویش وەك ئەو منالاّنەی تر کە لەوێ لەدایکبوون هەر بەبەرد ناوکیمان بڕی، خۆمانو بەختمان ئەوکاتە کەمێك باشتر بووین وەك سەرەتا نەبوو کە گیرابووین، جار جار کولّمان ئەکردو جلەکانمان ئەشۆریو وەك وتم چۆرە شۆرباکە هەبوو، بەشی ئەوە شیرم هەبوو منالّەکە تێری پێبخوات. بەلاّم نەهرۆمان هیلاك بوو، لەتاو ئازار خەوی نەبوو، ئیسراحەت نەبوو. ئێمە جاران منالّێکمان لە بێشکەیا بوایا ژورەکەمان لەسەر دائەخست ئەگەر لە حەوشە بارۆکەیەك گارەگاری بوایا دورمان ئەخستەوە بۆ ئەوەی دەنگەکەی منالّ خەبەر نەکاتەوە، ئێستا لەناو قاعەیەکا پڕ کرابێت لە ژنو منالّ ئەگەر منالّەکانت خەویشیان لێبکەوتایا بە گریانو هاواری منالّی تر خەبەریان ئەبوەوە، خۆ ئەمە مالّەکەی خۆت نەبوو هەموویان پێکەوە بخەوێنی، تۆ منالّەکەت خەوی ئەهات هەنێ لایلایەت بۆ ئەکردو خەو ئەیبردەوە، لەپڕ منالّی ژنێکی تر لە تەنیشتەوە لەتاو ئازار هەتا ئەیتوانی هاواری ئەکردو ئەیزیڕان، ئەو شەش مانگە دوو شەو بە ئیسراحەت نەخەوتووین منالّ گشتی چاوی سویر بوو بوو، بەخوا کە نەخۆش بوونو چاك نابوونەوە چەنێکی لەبەرئەوە بوو داودەرمانو خواردنی باشمان نەبوو، بێخەویەکەیش ئەوەنە زیاتر کاری لێیان کردبوو. ئێستایش هەر ئەلێم

ئەو حکومەتە بەمەبەست وای لێمان ئەکرد هەر بۆ ئەوەی بوو عەزابی زیاتر بچێژین، ئەگینا خۆ ئەیتوانی بیست وەجبە قاعەی تر لەولاترەوە دروست بکات مەعەسکەرەکە حەوشەی دنیای بەدەمەوە بوو، لەباتی ئەوەی هەر قەعەیەك ئەوەنە ژن و منالْت تێکردبوو هەر رێگە نەبوو پا راکێشی، هەر بێخەوی کوشتمانی، نیوەی ئەوەی تێبکردایا، نا بەخوا بۆ ئەوەی بووە هەتا ئەو رۆژەی روحمان دەرئەچێ سەعاتێ ئیسراحەتمان نەبێ.

نازانم چەنەم وەجبە بوو کە ئاوا جار جارێك بار دەکران و ئەبران، بەڵام وەجبەیەکیان بردو پێنج شەش رۆژێك دوای ئەوە لەناو حەرەسەکانەوە قسەیەکمان بەرگوێ کەوت کە گوایە سەدام عافواتی داوەو بەر ئەبن، ئێ ئەم قسەیە بۆ ئێمە وەك ئەوە وابوو روح بخەیتەوە بەر مردوو، کەس بەتەمای ژیان نەمابوو هەموو چاوەڕێ بووین یان بەدەم عەزابی جەرگمانەوە لە سجنەکە گیانمان دەرچێت یان وەك ئەو وەجبانەی تر بمانبەن و کەس نەزانێ لەکوێ دەمانکوژن. یەك دوو رۆژێ چاوەڕێمانکرد هەتا ئەو کاك هادییە هاتەوە بۆ دەوام لەوکاتەیا ئیجازە بوو، وتمان هەرچییەك بێت ئەو راستمان لەگەڵ دەکات. وەڵا بەیانیانێکی زوو بوو هاتەوە قاعە قاعە سەری لە هەموومان ئەدا هەر لە دوورەوە بەڕوییە خۆشەوە دەستی راتەوەشان (عافوات دراوە هەموو دەڕۆن بۆ ناو کەس خۆتان)، ئیتر لە خۆشیا هەناسەیکمان کەوتەوە بەر، پێشتر هەموو بێزارو بێتاقەت وەك ئەوەی هۆشمان بەخۆمان نەبوبێت وابوو، بەڵام

ئیتر روح شیرینە گوڕێکمان گرتەوە. ڕۆژانی تر کە بیری کەسوکارمان ئەکرد هەر لە خەیاڵی رابردوویا بووین چۆن ژیاوینو لەکوێ پێکەوە بووین، بەڵام ئێستا ئیتر بە دەقەو بەسەعات کەسوکارمان ئەهاتنەوە بەرچاومان کە بەر ئەبینو ئەچینەوە بۆ لای یەکتری. باوك منداڵەکان چونکە تەنها پەخشانمان هەبوو ئەمانەی تر هەموویان کوڕ بوون، بەخوا رەنگە لە هەموویان زیاتر پەخشانی خۆشویستبێت، ئەمووت ئەم کچەیشمان بووە دڵنیام بەقەدەر یەك دنیا حەز ئەکات کە خوا کچێکی تری داوە پێمان. ئیتر خەیاڵی دایكو باوكو براو خۆشكو خۆشکەزاو بابای منداڵەکانو هەموومان یەکئەگرینەوە. ئەمووت بەس نەبوو یەکێ لە منداڵەکان شتێکی لێنەهات لای محەمەد چیم بووتایا، قەت لێم خۆش نابوو. خەمی نەهرۆیشم بوو ئەترسام هەتا ئەڕۆینەوە چاك نەبێتو باوکی ئاوا ببینێت وا ئەزانێ من کەمتەرخەم بوومە بەرانبەری نەمبردەتە دکتۆرێ شتێ، بەڵام هەر خۆم بیرم لەوەیش ئەکردەوە ئەگەر ئەوانیشیان وەك ئێمە بردبێ بۆ سجن ئەوە بەچاو خۆی بینیویێتی حاڵی ئەو سجنانەو زاڵمی حکومەتەکە چۆن بووە.

ئیتر هەرچی ئەو خەڵکەت ئەبینی هەر لە ئیرادەی خواوە رەنگیان هەڵهێنابووەوە، منداڵەکان ئامین براژنم لە ئیمە زیاتر کەوتبوونە خۆشییەوە، ئەو نەگبەتانە وەك باوکیان لەگەڵمان نەبوو لە تۆپزاوا دیکیانو دوو خۆشك تریانو براکەیشیان جیاکرانەوە لێیان. سەیر هەر کەسێکت ئەکرد دەم بە بزە بوونو ئەتزانی هەمووی هەر بە هیوای

ئەوەوە چاوەڕێی کردنەوەی دەرگای قاعەکانین کە بچینەوەو لەگەڵ کەسوکار یەکبگرینەوە. ئێمە تینوێتیو برسێتیو نەخۆشیەکە چەنێ ئازارمانی دابوو، عەزابی لەیەکدابڕانمان لەگەڵ کەسوکارەکەمان زۆر لەوە بەسوێتر بوو.

بەڵام خەمی ئەوەم بوو پرسیارمان لە کاك هادی نەکرد کە ئایا عافواتەکە عامەیە یان هەر بۆ ژنو منداڵەکانە، ئەو رۆژە تا هەڵگەڕاوەتەوە بەیانیو ئەو پیاوەمان بینیووەتەوە هەزار داڵغەم کردووە، جارێ ئەهاتنە بەرچاوم لەگەڵ باوكو براو باوكو بابای منداڵەکان هەمووومان ئەچینەوە ئەگەر حکومەت ڕێگەیدا لە ئاوایی ئەبینو ئەگەر نەیشیانهێشت ئەچینە موجەمەع. لەناکاو ختوکەیە بەدڵما ئەهات ئەی ئەگەر عافواتەکە هەر بۆ ئێمە بێتو بڕۆینەوەو زەلامەکان بەرنەدەن، چی بکەین، بەخوا خۆزگەم ئەخواست خوایە ئەگەر هەمومان پێکەوە بەرنادەن یاخوا ئێمەیش بەو دەردەوە بهێڵنەوەو هەر لەو سجنە بمرین باشترە، خوانەخواسە هەواڵی ئەوە ببیستین کە زەلامەکان نایەنەوە. وتیان نا عافواتەکە عامەیەو ئەوەی لەژیان مابێت هەمووی بەر ئەبێت، ئیتر ماخۆلانی ئەوەم بوو خوایە کەسیان هیچیان لێنەهاتبێتو هەموویان زیندووبن توخوا ئەگەر نەخۆشیش بن بە نەخۆشیش بێت یەکجارتر یەك ببینینەوە. ئینجا خەفەتم بۆ ئەو ژنانەیش ئەخوارد کە لە قاعەکان لەگەڵمان بوونو منداڵەکانیان مردبوون، ئەگەر بمانایەتە ئێستا بە نەخۆشیش بوایە بەر ئەبووین دوای دکتۆرو

دەوا هەبوو، ئەگەر لەکاڵەکەی خۆیان بیشمردنایا هەر باشتر بوو لەوەی کەس نەزانێ لێرە قەبریان کەوتۆتە کوێوە، وا ئەوە زانیشیان خۆ کێ ئەڵێ ئێمە بەریشبین جارێکیتر حکومەت رێگەئەدا ئەم دایکانە بێنەوە سەر قەبری جەرگەکانیان. ئەگەر لەناو کەسوکاری خۆتا بیشمرین هیچ نەبێ قەبرەکەت هەبوو هەر سەبورییەك بوو.

لەدوای ئەو هەواڵەوە کە وتیان بەرئەبین هەتا ئەو سەعاتەی خستمانیانە سەیارەوە کە بمانهێننەوە، ناخۆشترین شت ئەوە بوو نە رۆژمان لێدەڕۆیی و نەشەو. بڕوا ئەکەی لەو رۆژەوەی عافواتەکەی داوە هەتا بەربووین وابزانم بیست شەوێکی پێچوو، ئەو شەش مانگەی تر کە سجن بووین لەبەرچاومان بەقەدەر ئەو بیست رۆژە درێژەی نەکێشاوە.

پێشتر چەند وەجبەیان لێمان بردبوو ئەوانە بوون کە نەهاتنەوە، چەند وەجبەیان هەر ئاسەواریان نەما، بەڵام وەجبەی ئاخریان خۆیان و قسمەتیان بردبویانیانە تکریت و عافواتەکەی دابوو، دوای چەند رۆژێك ئەوانیان هێنابووەو بەریانیاندا. بەڵام ئەیانووت لەناو سەیارەی موقەپەت بردوومانیانە بۆ تکریت، لە دوبزەوە هەتا گەیشتبوونە ئەوێ چوار مناڵ لەناو سەیارەکە گیانی دەرچوو بوو ئەوەنە گەرم بوو بوو ناو سەیارەکەیان.

بە چەند وەجبەیەك ئێمەش بەدوای یەکا ئامادەکراین بۆ ئەوەی بمانبەنەوە ناو کەسوکارمان، ئەو وەجبەیەی منی تیابووم رۆژی (١٩٨٨/١٠/٢٥) بوو لە دوبز خستمانیانە سەیارەوە. بەڵام چەند رۆژێك

پێش ئەوە ئەمرۆ کوڕە بچوکەکەم تەواو پەرێشان بوو بوو. هەر ئەپاڕامەوەخوایە گیان ئەم شەش مانگە روحیت نەکێشاوە ئەم چەند رۆژەیش بیپارێزە هەتا ئەگەمە ناو قەومو قیلەی خۆمو با یەك جاریتر باوکی بە زیندوێتی بیبینێتەوە، خواردنی نەبوو، نیوەڕۆ بە نیوەڕۆ چۆڕە شۆربایەکیان ئەهێنا ئەمکردە دەمییەوە هەڵی ئەهێنایەوە، خۆیشم پێشتر بەهۆی ئەوەی دوگیان بووم زوو شیرم نەما، بەڵام ئێستا کە مناڵەکەم بوو بوو شیرم هەبوو، ئەمویست شیری خۆمی بدەمەوە هەرچیم ئەکرد مەمکەکەی ناگرد. هەر هاواریشی بوو برسیمە داوای نانی ئەکرد، داوای خەیاری ئەکرد، ئێستایش نەمزانی چۆن وا خەیار کەوتبووە سەر دەمی هەر ئەیووت نان، خەیار ئەخۆم. ئەو رۆژە کە نۆرەمان بوو بێینەوە تەواو کەوتبووە هیلاکەتەوە، سەمونە رەقەکەم دابووە دەستییەوە ئەوەنە نابوویە دەمی هەمووی کردبووە خوێن، ئاوا لەباوەشم روحی دەرچوو. کردمانە شینو گریان هەر هاروشێت بووین، ئاخر ئەبوو ئەمرۆ ئێمە بەربدەنو بە روح زیندوو بیهێنمەوە، بۆ لەم کاتەیا گیانی بەخشی.

حەرەسەکان چەند هەوڵیاندا تەرمەکەیان بدەمێ نەمهێشت بیبەن ئەمووت کوڕەکەم زیندووە، خۆم گوێم لە ترپەی دڵێتی. ئەمنوسانە خۆمەوەو ئەمووت ئەوەتا دەنگی دێ، ئەیبەمەوە. خۆی ئەمزانی مردووە، بەڵام ئەمویست جەنازەکەیان نەدەمێو لەگەڵ خۆم بیهێنمەوە هیچ نەبێ باوکی وەك بە روح زینووی نەکردەوە باوەش با لاشەکەی

ببینێ، له شوێنێ بینێژم بتوانین بچینه سەر قەبرەکەی. ئیتر بە ڕەوێ منداڵەوەو منداڵێ شیرەخۆرە کە هێشتا چلەی نەچووبوو، بە تەرمی منداڵێکەوە خستمانیانە ناو سەیارەی (موقەیەتەوە). گەلێ زەحمەتە بەرگەی ئەوە بگریت جەنازەی منداڵەکەت بەسەر دەستەوە بێت. هەر کە سوار سەیارەکە کرایین ئیتر ترس ئەوە دامیگرتەوە بەخوا تاقمان ناگەینە ماڵو هەموومان هەر لەناو ئەم سەیارەیە ڕوحمان دەرئەچێ. ئێمە ئەوکاتەی لە چەمچەماڵەوە هێنامانیان بۆ تۆپزاوا هەرچەند هیلاك و تینوو برسی بووین، بەڵام لە چاو ئێستاوە زۆر بەگوڕ بووین خەریکبوو لەناو سەیارەکە بتاسێین، ئێستا بەم حاڵەوە لە کوێ جارێکیتر بەرگەی چەند سەعاتێکی ناو ئەم سەیارەیە ئەگرین. نازانم هی ئەوە بوو پایز بوو دنیا فێنکی کردبوو، نازانم ناو سەیارەکە هەوای فێنکیان بۆمان کردبووە، یان ئەو جارەی هاوردمانیان بە ئەنقەست بۆ ئەوەی بمانکوژن ناو سەیارەکەیان گەرم کردبوو، ئەمجارە ئاوا ناڕەحەت نەبوو. تەنها هەر ئەوەی لە جاری پێشوو ئەچوو کە دەشتەوەمان نابینی. ئیتر بەهۆی مردنەکەی نەهرۆوە ئەو خۆشیەیشمان نەما کە چەند ڕۆژێك بوو دڵمان خۆش بوو کە بەرمان ئەدەن، هەتا بڵێم ئێمە دڵمان خۆش بووە بۆیە هەستم بە ناڕەحەتی ناو سەیارەکە نەکردووە، نا بەخوا هەر جاری یەکەم لەناو سەیارەکان هەوایان لێمان بڕیبوو ویستبوویان بمرین و خوا نەمانیکوشت. سەیارەکان چەند سەعاتێ هەر بەڕێگاوە بوون لە شوێنێ دامانیانگرت وەك حەوشەی مەکتەب وابوو، خەڵکەکە هەبوون خوێنەوار

بوون خوێنایانەوە وتیان ئەمە مەکتەبێکە لە (عەرەبەت). لەوێ ناومانیان نوسییەوە هەر خێزانەو چەند نەفەرین ناو سەرۆك خێزانەکەو پارچە کاغەزێکیان دایە دەستمانەوە هەنێ شتی بە عارەبی لێنوسرابوو مۆرێکیان دایە بانیا. لەوێش خەریکبوو جەنازەی کوڕەکەم لێبسەنن وتیان ئەوە مردووە، بەڵام کەوتمە مل دەستوپێیاناو هەر نەمدا پێیان، ئەمجارە سوار سەیارەی بیستو یەك نەفەریمانیان کرد، بەڵام مەدەنی نەبوون رەنگەکانیان عەسکەری بوو، وەڵا سایەقەکانیش هەر عەسکەری بوون. خوایە گیان بۆ کوێی ترمان ئەبەن، ترسمان لێنیشتەوە بەخوا ئەمجارەیش درۆیان کردووە ئەگەر بیانویستایا بەرمان بدەن با هەر لە کەرکوك یان بمانیانبردایا بۆ چەمچەماڵ بۆچی ئێمەیان هێنابووو بۆ ئەم ژوێرە، چی ئیشمان لای سلێمانی هەبوو. سەیارە مونشەئەکان هەڵسوڕانەوەو بەرەو سلێمانی کەوتنەوە رێ، بە تەنیشت سلێمانیا هاوردمانیان ئیتر لەناو سەیارەکە هەبوو جاریتر سلێمانی بینیبوو ئەیانزانی ئەمە سلێمانیە، لەوێش دەرچوینو بەرەو چەمچەماڵ گەڕانمانیانەوە، بەڵام لەو دۆڵ بازیانە[٩٥] لایانداو هەموومانیان هەر لەو سەرجادەیە لە سەیارەکان داگرتە خوارەوەو وتیان بڕۆن ئیتر ئێوە ئازاد بوون. وادنیایش بەرەو خۆر ئاوا بوون ئەڕوات، ناشوکری خوا نەبێت ئێمە وەختمان بیر نەمابوو، بەڵام وەرز پایزێکی درەنگ بوو تەواو سارد

---

[٩٥] - دوونێوانی دەربەندی بازیان و تاسلوجە کە لە چەند کۆمەڵگایەکی نیشتەجێبون و چەند گوندێك پێکهاتووە بەهەمووی دەوترێت بازیان.

بوو بوو، نەدیوو نەشارەزا، من بە جەنازەیەکەوە روو بکەمە کوێ. هەر ئەوەنەمان زانی خەڵك باینجان [96] و کانی شەیتان[97] لەماڵەکانەوە بەرەو پیریمان هاتن ئەتووت هەمووی کەسوکار خۆمانە، کەوتنە ناومان‌و ئیتر هەر خێزانەو چەند کەسێکی بردە ماڵەکەی خۆی، ئێمە پیاوێك بردمانێ ماڵ خۆیان ناوی کاك عومەر بوو لە (کانی شەیتان) نان‌و ئاویان داپێمان‌و ئەو شەوە لە کانی شەیتان لەو ماڵەماینەوە. ئەو ماڵەی ئێمەیان بردبووە ماڵەکەی خۆیان چوون مەلایەکیشیان هاوردو داوایانکرد لاشەی کورەکە بنێژن، نەمهێشت، هەرچەندە وتیان گوناحە بمێنێتەوەو تازە خوا هەر ئەوەنە بەتۆی دابوو، بە مەلاکەم ووت بەخوا بیشمکوژن نایدەم، ئەیبەمەوە بۆ ناو کەسوکارەکەم با باوکی ببینێت لەوێ دەینێژین. ئیتر قەناعەتیان کردو ئەو شەو رۆژە ئەو تەرمەم نوساندبووە سینگ خۆمەوە.

دیار بوو هەواڵ رۆیشتبوو کە ژن‌و منالّ ئەنفالیان هێناوەتەوە لەو دۆڵ بازیانەن، بەیانی زوو یەك دنیایە خەڵك هاتبون بەدوای کەسوکاریانا ئەگەڕان. چونکە پێش ئێمەیش وەجبەی تریان هێنابووەوە ئیتر لەوە ئەچوو ئەوەی یەکێکی ئەنفالە چاوەڕێی هاتنەوەی وەجبەی تری

---

[96] -باینجان کۆمەڵگەیەکی نیشتەجێبون بوو (ئۆردوگا) لە دۆڵی بازیان، دوای راگواستنی قەڵادزێ بەشێك لە دانیشتوانەکەی بۆ باینجان راگوێزران، هەروەها بەشێك لە گوندەکانی ناوچەکانی دەوروبەری برانە ئەو ئۆردوگایە.

٩٧ - کانی شەیتان گوندێکە لە دۆڵی بازیان، ٢٥کم دەکەوێتە خۆرئاوای سلێمانییەوە.

بووبێت، بۆیە خەڵکێکی زۆر زۆر هاتبوون. سەیرمانکرد حەمەوینی برایشم لەناو ئەو خەڵکەیەو بەدوای ئێمەیا ئەگەڕێت.

هەر ئەوەنە چاوم بە براکەم کەوت ئیتر لە خۆشیا وەك ئەوەی خوا لە ئاسمانەوە بەری دابێتەوەو بۆ ئێمەی ناردبێ گشتمان بەدەم گریان‌و شیوەنەوە دەورماندا، ئەو لە ئێمە خراپتر تاوێ هەر هەنسکمان داوەو قسەمان بۆ نەکراوە. کەوتینە پرسیار کەسوکار ئەو وتی شوکر بۆ خوا هەموو باش‌و سەلامەتن و تەنها خەمی ئێوەمان بووە. دیار بوو ئەو لەبەر ئێمە وای ووت، سەرەتا باوەڕم بە قسەکانیکرد، بەڵام دوای بیرمکردەوە باشە ئەگەر هەموو سەلامەتن بۆچی هەر ئەم هاتووە بەشوێنمانا، ئەوە قەینا دایك‌و باوکم‌و بابای مناڵەکان کەنەفت بوون، ئەی کوا براکان ترمان کوا باوك مناڵەکان بۆ کەس نەهاتووە، کەوتمە ئەوەی ئەبێ سوێندم بۆ بخۆیت کوان لەکوێن، ئەمجارەیش وتی هەواڵ بڵاوبۆتەوە ئێوە هاتوونەتەوە خۆ نەیانووتووە لە بازیانن هەتا هەمومان بێین بۆ ئێرە، هەریەکی بەلایەکا ڕۆیشتوون بە هاواری ئێوەوە. ئینجا باوەڕم بە قسەکانی کردو پرسیار هەرکەسیانم ئەکرد ئەیووت ئا چەند ڕۆژێکە هاتوونەتەوە، یان ئەیووت هەنێکیان لێهاتۆتەوەو پێکەوە بوونە ئەوان لە وەجبەی دواتر دێنەوە.

کەوتینەڕێ بەرەو چەمچەماڵ ئیتر ئازاری نەهرۆی کوڕم جارێکی تر سوێی خستەوە برینمان، ئەبێ باوکی ئێستا چی بکات ئاوا جەنازەکەی ببینێ، دەبێت چەند بەهیواوە چاوەڕێی بینینەوەیانی کردبێ، چەند

نائومێد بێ جەنازە بەسەر دەستمەوە ببینێت. بیرم ئەکردەوە لەبەر باوکی ئەڵێی جەنازەکە دانەگرم با یەکەمجار نەزانێو دوای پێی بڵێم، ئەیشمووت ئەی ئەگەر هەموومان دابەزینو ئەومان لەگەڵ نەبێ یەکسەر ئەزانێو ئەڵێ ئەی کوا نەهرۆ، هەرچۆنێك بێت بیدەمە سەرشانما وەك ئەوەی خەوتبێت هەتا ئەیبەمە ژوورەوە نەك راستەوخۆ بە بینینی لاشەکەی نەهرۆ دڵی دابخورپێ. کە گەیشتینە چەمچەماڵ چوینە ئۆردوگای شۆڕش بۆ ماڵ زەینەب خۆشکم ئەوان ماڵیان بردبووە ئەوێ، کە دابەزین هەر وامکرد وەك ئەوەی نەهرۆ خەوتبێ دامە سەرشانما. بەڵام کە چووین تەماشامانکرد کەسی لێنیەو زەینەب هەر چاوی بە ئێمە کەوت بۆ ئەو حاڵەی بەسەرمان هاتبوو کەوتە باوکەڕۆو براڕۆو خەریکبوو خۆی کوت کوتکات، ئیتر تێگەیشتین حەمەوینی برام لەبەر دڵی ئێمە وتوویەتی هەموویان هاتوونەتەوە. لەوێ زەینەب خۆشکم هەواڵ هەمویانی لابوو. سەلمەی خۆشکمو ئامین براژنم زیاتر لە دوو هەفتە ئەبوو گەڕابونەوە، ئیتر لەو هەموو کەسوکارە کەسیتریان نەگەڕابوونەوە. محەمەد باوك مناڵەکانو بورهان مامەیانو عەلیو غازی برام لەگەڵ زەلام ئەو ئاواییانە هەر لە هەردەکەوە برابوون بۆ (سیمەکەی لەیلان)[98] و لەوە بەولاوە کەس هیچ سۆراخێکیانی

[98] - لەکاتی پرۆسەی ئەنفالدا بەشێك لەو گەنجانەی لە گوندەکان دەستگیرکرابوون راستەوخۆ گوێزرابونەوە بۆ لەیلان، لە ناو تەلبەندی سەربازگەیەك کۆکرابونەوەو دواتر بۆ شوێنەکانی گوللەبارانکردن رەوانە کرابوون، لەناو کەسوکاری ئەنفالکراوان بە سیمەکەی لەیلان ناودەبرێت.

نەزانیبووە، ئەیووت کەس بەتەمایان نەبووە، بەڵام چونکە ئەم چەند وەجبەیە لە دوبزو نوگرەسەلمانەوە گەڕابووینەوە ئیتر خەڵکەکە ئومێدیان هەبوو کە ئەوانیش لە هەر کوێ بن بەریانبدەن‌و بێنەوە ناومان. دایکم‌و باوکم‌و جەیران برازنم‌و منداڵەکانی، ئەها باسمکرد وتم ژن‌و منداڵەکان عەلی برام لەگەڵ دایك‌و باوکم ئەوکاتە کاك عەبدولخالق خزممان هاتە شوێنیان، لەگەڵ خێزان‌و منداڵەکانی نوری برام، شوکر بۆ خوا ئەوان بەسەلامەتی گەیشتبوونە کەرکوك‌و هیچیان بەسەر نەهاتبوو. نوری برایشم کە ئێمە لە ئاوایی کەوتینەڕێ ئەو بەلای مەڕەوە بوو نەمانزانی چی بەسەرهات، زەینەب وتی بەو چەم‌و هەڵەتانەیا خۆی گەیاندبووە کەرکوك‌و ئەویش بەر نەکەوتبوو. ئیتر ئەوان هیچیان لە بارەی ساڵح برام نەئەزانی، من پێیانموت کە کاکەمم بینیووە لە تۆپزاوا لەگەڵ کاك نەجمەدین زاوامان، وتیان دوایی لە کاك نەجمەدینیش جیا کراوەتەوە، ئەو هیچ سۆراخێکی نییە، بەڵام نەجمەدین برابوو بۆ نوگرەسەلمان‌و ئەویش ئێستا گەڕاوەتەوە. ئامین برازنیشم کە گەڕابووەوە دوان لە کچەکانی لەگەڵ نەبوو لەوان وایە مردوون، ئامین خۆیشی نەیزانیبوو لەدوای ئەوەی ئەوانیان بردو دوو کچەکە بەجێمان نەیزانیبوو چیان بەسەرهاتووە، ئەوەی بۆیان گێڕابووەوە کە ئەوان خراونەتە ناو مونشەئەوەو بە ژمارە سەریانخستوون لە نۆرەی ئەو دوو کچەیدا دەرگایان داخستووەو گەڕانویانەتەوە، بەڵام دایکیشان نەیزانیبوو ئایا عەسکەرەکان کچەکانیان هێنابووەوە بۆ لای ئێمە یان

چیان لێکردووە، دوای دایکیان ئەیگێڕایەوە ئەو شەش مانگە چەنێ خەفەتی بۆیان خواردووەو رۆژانە چەنێ گریاوەو پاڕاوەتەوە کە کچەکانیان گەیاندبێتە دەستی من. باش بوو ئەوانیش هاتبونەوە ئەیانووت لە قەڵایەك سجن بووینە لەناو عارەبسان ناوی نوگرەسەلمان بوویە. کاکەم سالح هەر ئەو بینینەی ئێمە بوو لە تۆپزاوا ئیتر کەس لەوانەی لە نوگرەسەلمانیش هاتنەوە نەیانبینیبوو، یاخوا کوێربم رەنگە هەر ئەوکاتە لە تۆپزاوا مردبێ کە نازدار چاوی پێوە بوو بوو عەسکەرەکان لەسەر ئەوەی نوێژی کردبوو لێیاندابوو. سەلمەی خۆشکیشم چوار لە منداڵەکانی هەتا ئێستاش بێسەروشوێنن، وەڵا خوایە تۆبە یەکێکیان ناوی رێبوار بوو ئەو لەگەڵ خۆی بوو لە نوگرەسەلمان لەوێ مردبوو ئەیووت تەرمەکەیان داوەتە دەم سەگەڕە شەکانەوە.

سەلمە هەتا .ئەم ساڵانەی دوایش کە مرد[99] بەردەوام دیمەنەکەی لەبەرچاوی بوو هەر باس ئەنفال ئەکریا ئەو دەستی ئەکرد بە گریان، ئەیووت بەچاوخۆم بینیم کە سەگە رەشەکان دەمیان خستبووە ناو لاشەکەی رێبوارو دڵو جەرگەکەیان دەرهێناوەو خواردویانە. ئەوانەی لە نوگرەسەلمان بوون وەزعیان لەئێمە خراپتر بووە، ئەیانووت لەبرسا ئەوەنە رەق و وشك بووبوینەوە هەر پێستەکە و ئێسکەکەمان مابوو، کە یەکێ ئەمرد سەگەکان پێستەکەیان ناخوارد، زگیان ئەدڕی و دڵ و جەرگ و ناو زگەکەیان ئەخوارد. سەلمەی خۆشکم رێبواری لەوێ ئاوا

[99] - سەلمە عزیز بابا، لە ٢٠١٩/٧/١٣ کۆچی دوایکردووە.

ڕۆیشت و سێ دانە کوڕی جاحێڵی هەر لە تۆپزاوا لێیان جیاکردبووەو ئەوە هەتا ئێستایش وەك ساڵح برام هەواڵیان نییە. حاجی ئەحمەد بابای مناڵەکان برابوویە نوکرەسەلمان لەوێ مردبوو، خەڵك بینیبووی لەوێ. ئیتر بورهان شوبیرامو محەمەد باوك مناڵەکان هەر سێ براکەمو سیان لە خوێشکەزاکانم ئێستاش نەمانزانی چیان بەسەرهات.

لەوێ خزمو ناسیاو لێمان کۆبوونەوەو چون تەرمەکەی ئەحرۆیان شۆردو کفنیان کردو بردیان لە گۆڕستانی (سەید زەنور)[١٠٠] بەخاکیان سپارد. هەتا ماوەیەکیش گەڕابوینەوە هێشتا هەروەك ئەوە وابوو لە خەودا بین نەمئەزانی ئەوەی بەسەرمان هاتووە راست بوو خەوو بوو، هەرچەندم ئەکرد ناهاتمەوە سەر خۆم، خزمەکان سەریان لێمئەداو دڵمیان ئەدایەوە، خەسوم لە کەرکوك بنەوانی لوقمان بوو هاتەوە لای ئێمە، دایكو باوکم ئەهاتنو هەر بە دەورمەوە بوون، تا ئەوکاتە بوو وایانئەزانی بەهۆی سەمونە خوێناوییەکەی ئەحرۆی کوڕمەوەیە کە لە ژورەکە هەڵمواسیبوو رۆژانە دامئەگرتو بەدیارییەوە ئەگریام، هەر حسابم ئەکرد تۆ سەیرکەن ئەوە ئەحرۆ رۆیی باوکی گیریاوەو دیار نییەو باپیرەیشی بەو حاڵەوە رۆیشت لەناو عارەبسان لە برسا کوشتیان. یەعنی سێ پشتی یەك لەدوای یەك، ئاخر خوا چۆن دەبێ ئەوە قبوڵ بکات سێ پشتی کورد بەیەکەوە لەناو بەرن. بۆیە سەمونەکەیان برد

---

[١٠٠] - لە بنەڕەتدا (سەید زەنون)ە، بەڵام لەناو خەڵك بە سەید زەنور بەکار دەبرێت. گۆڕستانێکە لە گوندی پیریادی و ئێستا بووەتە یەکێك لە گۆڕستانەکای ناحییەی شۆڕش.

وتیان با لە بەرچاوت نەبێ، یان شێت ئەبیت یان ئەوەنە خەفەت ئەخۆیت بەرگە ناگریت‌و ئەمریت‌و منداڵەکانت سەرگەردان ئەبن.

با ئەوەیشم بیرنەچێ ئێمە ئەوکاتەی گیراین‌و ئەوەنە سجن بووین نەمانئەزانی بە ئێمە ئەڵێن ئەنفال، بەڵام کە هاتینەوەو لەماڵ زەینەب خۆشکم بووین خەڵك ئەهات بۆ لامان‌و پرسیار ئەکرا، چەند جارێ ئاوا گوێم لێبوو ئەیانووت کە وەجبەی یەکەمی ئەنفالەکان هاتنەوە یان کە باس زەلامەکان ئەکرا ئەیانووت عافواتەکە بۆ هەموویەتی‌و ئیشەڵا هەموو ئەنفالەکان بە وەجبە دێنەوە، بووە ماخۆلانم پرسیم ئەنفالەکان چیە؟ وتیان ئێوەن، بە ئێوە ئەڵێن ئەنفال. ئەوەنەیشم پێناخۆش بوو ئەیانووت وەڵا ئەمە لەناو قورئانا هەیە، بەخوا من خۆم ناسیبووەوە نوێژم کردووەو رۆژوم ئەگرد قەت ئەنفالی تیا نەبوو ئیتر نازانم بۆچی ئەیانوت سەدام بەناو ئیسلامەوە ناومانی نابوو ئەنفال.

ماوەی مانگێ زیاتر بە خۆم‌و منداڵەکانەوە لەماڵ زەینەب خۆشکم مامەوە، دوایی چوینە خانویەك پیرێژنێکی تیابوو مانگی بە (٢٥) دینار بوینە کرێچی ئەو. دایك‌و باوکم گەلێ حەولیاندا بچمە لای ئەوان، نەچووم ئێمە خۆمان خێزانێ بووین خەسویشم لەگەڵمان بوو، ئێ ئەوانیش تەنیا یەك غورفەیەکیان هەبوو لەگەڵ بەرهەیوانێ نانەکەیان لەوێ دروستئەکردو ئاودەست‌و سەرشۆرکێکیان بوو، نوری‌و منداڵەکانیشی هەر لەگەڵیان بوون جێمان نابوویەوە. هەر بە ئومێدیش بووین زەلامەکان بێنەوەو ئەموت هەر چۆنێك بێت لە کرێچێتی ئیدارە ئەکەین هەتا

محەمەد دێتەوە، ئیتر دوای بزانین ئەکەوینە کوێوە. بەڵام خوایە بەچی کرێ خانوو بدەم، وا هەرچۆنێك بە هەزار ئەملاو ئەولا ناوەکەمان نوسیبەوە، چونکە پێشتر ئێمەیان لە ئیحسا رەشکردبووەوە[١٠١] ناومان نەمابوو، بایەعیمان[١٠٢] نەمابوو، هەرچۆنێك بوو (بایەعییەکەمان) چاك کردەوە، بەڵام خۆ ئەبێ پارەی کرێی خانوومان هەبێتو شتێکمان هەبێت بۆ ئەوەی جلو جۆرێ شتێکمان هەبێ منداڵەکانی پێ بەخێوو بکەم.

ئێمە لە ئاوایی‌و لە جێورێی خۆمان چەند جارێکی تر لێمان قەومابوو بەڵام لەوێ چونکە مەڕوماڵاتمان بوو زەویی‌و زارمان بوو، زەلامەکانیش هەبوون ئەوان خەمی ئەوەیان ئەخوارد چۆن بکەوینەوە سەر خۆمان. بەڵام ئێستا من بەم حاڵەوە بە جەرگ سوتیاوو منداڵ بەرمەمکەوو کۆشێ خێزانەوە، نەدیوو نەشارەزا چی بکەم، بەخوا کە لە سجنیش بەربووین هەتا ساڵانێکی زۆریش کورە هەتا مەعاشەکەیان بۆمان بڕییەوە[١٠٣] ئێمە ژیانمان هەروەك ناو سجنەکە ناڕەحەت بوو، بەس ئەوەتا سجن نەبووین ئەگینا ئەوەن نەبوو بووین ئەوەن فەقیریمان بینی

---

[١٠١] - لە سەرژمێری گشتی دانیشتوان ساڵی ١٩٨٧ بەشێك لەناوچەکانی کوردستان وەك ناوچەی دەرەوەی دەسەڵاتی عیراق دیاریکران و لەسەرژمێری گشتی وەك هاوڵاتی عیراق تۆمار نەکران.

[١٠٢] - پرۆگرامێکی خۆراکی بوو لە ساڵی ١٩٦٨ لەدواوە حکومەتی عیراق پەیڕەوی دەکرد، بۆ هەر هاوڵاتییەك رێژەیەکی دیاریکراو خۆراك و پێداویستی بەشێوەی مانگانە دابەش دەکرا.

[١٠٣] - لە ٣/٢ ساڵی ٢٠٠٢ حکومەتی هەرێمی کوردستان بڕیاریدا موچە بۆ وارسی ئەنفال تەرخان بکرێت، ئەوکات بڕەکەی ٣٠٠ دینار بوو.

هەر باس ناكرێ. ئەوەی خزمو كەسی هەبوایا باشتر بوو، بەڵام ئێمە كەسوكارو بنەماڵە و خزمەكانیشمان زۆربەی وەك ئێمە وابوون. ئەوجا خەڵكیش وەك ئێستا هەبوو نەبوون، خەڵكەكەیش لە ترس حكومەت نەیئەوێرا هاوكاریو یارمەتی كەس بدات. ئەگەر یەكێ خێرێكیشی بوایا دەبوو كەس نەزانێو بیداتە ماڵە ئیحتیاجێ. فەقیرەكەیش زۆر بوو ئەم شۆڕشەی تۆ ئەیبینی سەرپاك ماڵە لێقەوماو بوو.

دەبوو بیر لە ئیشێك بكەمەوە بە دەستو بازو بكرێت، خۆ من ئەوەنە دەستو پێ سپی نەبووم، دەمتوانی هەموو ئیشێ بكەم بەڵام ئیش نەبوو نەیشمان ئەزانی لەكوێ ئیش بدۆزینەوە. بەخوا لە بیرمە یەكەمجار لەگەڵ هەنێ لەو ژنانەی تر كە وەك ئێمە بوون كەوتینە (بەرد فرۆشتن). رەنگە ئێستا كە ئەیگێڕمەوە خەڵك پێی سەیربێت بڵێن چۆن بەردیان فرۆشتووە؟ یان كێ بەردی كڕیووە؟ ئەوكاتە ئەم ئۆردوگای شۆڕشە تازە دروستكرابوو ئەو ماڵانەی پێش ئەوەی ئەنفالەكەبێ هاتبوونە شارەوە لێرە هەریەكی پارچەیەك زەویو شتێ پارەیشیان دابوو پێیان تا سوكنەیەكی پێبكەن. ئەوەی تریش كە وەك ئێمە لە سجن هاتبووینەوە هیچ شوێنێ نەبوو هەمووی هەر رووی لێرە كرد، لە زۆر شوێن خەڵك خەریكی خانوو دروستكردن بوون بەردیان ئەكڕی بۆ بنتەمەڵ[١٠٤] خانووەكان، ئاوا هەتا ئەژنۆیەك بەو بەردە بەرزیان ئەكردەوەو پڕیان ئەكرد لە خۆڵو بەردو لەبان ئەو بنتەمەڵەوە

---

[١٠٤] - بنتەمەڵ، بناغەی خانوو

خانووەکەیان ئەکرد. ئیتر هەروا دوو سێ ژن پێکەوە دەچوینە ئەو بنار (مەقانە)[105] لەو گردو قەتپاڵو ناو ئەو زەوی‌و زارانە بەردمان خڕ ئەکرد هەتا بای عارەبانەی تەرەکتەرێك بوایا سایەق تەرەکتەر لێمانیان ئەکڕی عارەبانەی بە پێنج دینار، بۆ ئێمە باش بوو ڕۆژانە دینارو نیوێ دوو دینارێکمان دەستئەکەوت. بەردەکەیان ئەهێنا لە شۆڕش ئەیانفرۆشتە ئەو خەڵکەی وا خانوویان دروست ئەکرد. ئینجا با شتێکی تریشت پێبڵێم لەبەرئەوەی کچەکەم شیرەخۆرە بوو (فێنك)، جەیران براژنیشم کوڕێکی بچوکی هەبوو (ڕێکەوت) ئەویش هەر شیرەخۆرە بوو بەنۆرە دەچوین بۆ ئیش، ڕۆژێ من ئەچووم بۆ کۆکردنەوەی بەرد ئەو دەبوو لەماڵ بێت شیر بداتە کوڕەکەی خۆیی‌و کچەکەی من، ڕۆژێکیش دەبوو ئەو بچێت بۆ ئیش‌و من لە ماڵ شیرەکەیان بدەمێ. بەو حاڵە ژیاین، بەو حاڵە پارەی کرێ خانووەکەمان ئەنایە یەکەوە. ئەوەش هەر ماوەیەك بوو ئیتر ئەو ئیشە نەما، چونکە خەڵکێ زۆر وەك ئێمە ئیحتیاج بوون هەمووی سەری تێژەن ئەو قەد پاڵو گردانە رەشی ئەکردەوە ئەتووت بۆ (کنگر)[106] ئەگەڕێن، هەمووی هەر بەردی کۆ ئەکردەوە. دوایی دەستمانکرد بە کرێکاریی، وەستای وا هەبوون ئێمەیان بە کرێکار وەرناگرت، بەڵام هەنێ وەستا هەبوون خوا چاکیان بۆ بکات دیار بوو

---

١٠٥ -مەقان زنجیرە تەپۆلکەیەکە ٩٠٠ مەتر لە ئاستی دەریاوە بەرزە، دەڕوانێتە سەر چەمچەماڵدا. تێڕوانینی جیاواز بۆ ناوەکەی هەیە، پێدەچێت راستترینیان (بان موغان) بێ.

١٠٦ - کنگر ڕۆکێکی بەهارەیە لە بەشێکی زۆری کوردستان دەڕوێت، بەچەند شێوازێك بۆ خواردن بەکار دەبرێت.

بەزەییان پێمانا ئەهاتەوەو خۆیان حاڵەکەمانیان ئەزانی هەر ژنیان ئەبرد بۆ عەمەلە، ئیتر لە خەفتەگرتنەوە لە چیمەنتۆ کێشانەوە لە بلۆك کێشان، هەموو ئەوەی زەلام ئەیکات کردوومە. بەڵام بە بۆنەی کچە شیرەخۆرەکەوە هەنێ جار کێشەی ئەوەم بۆ دروستدەبوو ئەو رۆژەی من نەمئەتوانی بچم وەستاکە لە شوێنی من ژنی تری ئەهێناو ناکرا بۆ رۆژ دوایی ئەو ئیزن بداتەوە لەبەر من، بەو هۆیەوە چەند جارێ کارەکەم لە دەست ئەچوو، ئەبوو بگەڕامایا بەسەر ئەو وەستایانەی رۆژانە دیواریان ئەکرد بزانم کرێکاریان ناوێ، هەتا ئاوا ئیشێ ترم ئەدۆزییەوە. هەر رۆژێکیش ئیشی کرێکاری دەست نەکەوتایا لفکەم ئەچنی.

بەهار هات دەچوین بۆ (کنگر) ئەویش باش بوو رۆژانەی مەسرەف منداڵەکانم دەرئەکرد هەنێ سایەق پیکاب هەبوو کنگرەکەیان ئەبرد بۆ کەرکوك ئەیانفرۆشت ماڵیان ئاوابێ رۆژ دوایی پارەکەیان بۆمان ئەهاوردەوە. کە دەستکەنەی نیسكو نۆك پەیا بوو دەستکەنەمان بۆ خەڵك ئەکرد، گوڵەبەڕۆژەمان ئەڕنی بە پارە، هەندێ دەغڵو دان هەبوو دەڕاسە نەیئەگرت بەدەست درەومان بۆ خەڵك ئەکرد. ماوەیەك ئەچوین بۆ کەرکوك لە خەستەخانەی (سەدام)[107] خەڵکیان ئەویست بە رۆژانە

---

[107] - زنجیرەیەك نەخۆشخانە لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی بیستەم لە پارێزگاکانی عیراق دروستکران و هەموویان ناونرابوون مستشفی سەدام، ئەو نەخۆشخانەیەی کەرکوك دوای کەوتنی سەدام لە ۲۰۰۳ ناوەکەی گۆڕدرا بۆ نەخۆشخانەی ئازادی.

**ناو ئاودەستو شوێن نەخۆشەکانمان پاك ئەکردەوە. ئینجا چی نەما نەیکەین.**

**ئا ئەوەیشم بیر کەوتەوە رۆژێ چویم بۆ لای قایمقام چەمچەماڵ ئەو وەرەقەیەم برد کە ئەو رۆژەی بەربوویمان دابویان پێم دامە دەستی، وتم حاڵەکەم ئاوایە لەوەتەی لە سجن بەربوینە بەم رۆژگارە ئەبێ کرێکاری بکەم، کرێچیمو وەك دێیەکانمانتان روخاند پارچەیە عەرزم بدەنێ منیش وەك ئەو خەڵکە چاوەیە خانووی تیا بکەم، لای خۆی کورد بوو خوا بیگرێت وتی برۆ با جەلال تاڵەبانیو مەسعود بارزانی[١٠٨] ئەرزت بدەنێ، هەر بەپاڵ کردمیانە دەشتەوە. کە شویم کردبوو ملو زنجیرێکیان بۆم کردبوو هەر مابوو، پێش ئەوەی وامان بەسەر بێت لای براژنەکەم دامنابوو لە کەرکوك خێزانەکەی حەمەومین برام، چوم هێنامەوەو دامە (٤٥٠) دینار. لە تەنیشت ماڵ باوکمەوە لە قادرکەرەمیەکان پارچەیە زەوی هەبوو لە بیرمە بە شەست دینار کڕیمان، ئیتر خۆمو خۆشکو براژنەکانم کرێکاریمان تیاکردو براکەم دیوارەکەی کرد، ژورێك بۆ خەوتنو ژورێك بۆ نان دروستکردنو ئاودەستو سەرشۆرکێکمان کردو بارمانکردە تەنیشت ماڵ باوکمەوە، چونکە خۆم ئەچوم بۆ ئیشکردن جار وابوو نەمئەتوانی بێمەوە، وتم ئەگەر لەتەك ماڵ باوکم بین ئەوەنە**

---

[١٠٨] - جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی دوو سەرکردەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد بوون. زۆرجار لەلایەن ئەفسەرو سەربازو بەرپرسانی عیراقەوە بەرانبەر بە هاوڵاتی کورد بەو جۆرە وەڵامی داواکارییان دراوەتەوە. یاخود لەبری جنێودانی راستەوخۆ بۆ کەسی بەرانبەر جنێو بەو دوو سەرکردەیەی کورد دراوە.

خەم منالّەکانم نابێ لەمالّ نەبم. نەنکیشیان ئەیتوانی چۆرە شۆربایەکیان بۆ دروستبکات‌و کچەکەیش هەراش بوو بەردەستی نەنکی ئەکرد.

سالّ هەلّگەڕایەوە کات کردنەوەی مەکتەب بوو دوان لە منالّەکانم خستە مەکتەب سالّح‌و رەحمان، بەلاّم کچەکەم پەخشان تەمەنی گەورە بوو وەریاننەگرت عومری گەیشتبووە دەسالّێك.

راپەڕین بوو وتمان ئیشەلاّ سەدام ئەڕوخێ‌و کەسوکارەکەمان دێنەوە، کەرکوك گیرا هەوالّ نەبوو هەر بە ئومێد بوین لەژیان مابن، ئەمانووت رەنگە برابێتن لە شوێنتر سجن بن. سەدام هاتەوەو خۆیشمان رامانکرد بۆ ئێران. مالّێ دراوسێمان هەبوو (مام رەسولّ) مالّی ئاوابێ تەرەکتەریان بوو، لەگەلّ منالّەکان خۆیانا ئێمەو مالّ دایك‌و باوکمی لەگەلّ خۆیان برد هەتا خورمالّ، بەلاّم چونکە زۆربووین‌و هەندێ زەخیرەو پێخەفی هەر سێ لامانی بارکردبوو جێی هەموومان نابووەوە، بەخوا ئەوانەمان کە ئەمانتوانی بەپێ رێبکەین لەم شۆڕشەوە هەتا خورمالّ پێ بەپێی تەراکتۆرەکە رێمانکردووە. بەلاّم باش بوو منالّەکان‌و دایك‌و باوکم‌و خەسویشم هەر بە تەمەن بوو ئەوانمان بە ئیسراحەت گەیاندە سنور. خۆمان بن پێمان ئەوەنەی هێلکەیە پەنما بوو، لە خورمالّ مالّ مام رەسولّ هاوسێمان مانەوەو وتیان ئیتر لێرە بەولاوە ناڕۆین، مالّ دایکیشم لەگەلّیان مانەوە، بەلاّم بەخوا ئێمە چونکە رەزالەتی ناو سجنی سەدامەمان بینی بوو نەمانوێرا لەوێ بمێنینەوە،

ئەوانمان جێهێشتو بەپێ بەرەو ئێران کەوتینە رێ، چوینە (نەوسود)[109]. ماوەیە لەوێ بووین نەنك منالەکان لە قەتپاڵی شاخێك بووین چوو دەستنوێژ هەڵگرێ پێی خزا کەوتە خوارەوە، بە گوریسو بەتانی هێنایانەوە سەرو ملی گشت شکابوو، بردیانە نەخۆشخانەی (پاوە)[110] دوانزە تەقەڵیان دابوو لە سەری، ئیتر بەو حاڵەوە ماوەیەك ماینەوە هەتا وردە وردە خەڵك کەوتنە گەڕانەوە بۆ شارەکان خۆیان ئێمەیش هاتینەوە بۆ شۆڕش. بەڵام ئیتر بێئیشیو گرانی رووی تێمانکرد لێرە کار نەما هەرچیمان ئەکرد چوار دینارمان پێپەیا نەئەکرا. ناچار لەگەڵ هەنێ ژنی تری ناسیاو روومانکردە حەویجە لەناو عارەب، لەوێ بۆ چنینەوەی پەموو پێویستیان بە کرێکار هەبوو دەبوو بەدەست بیرنین، ئەڕۆیشتین جار وابوو بە پانزە رۆژ بە بیست رۆژ ناگەڕاینەوە هەر لەوێ دەماینەوە، چونکە ئەوکاتە پارەی ئەوانو ئێمە جیاواز بوو،[111] ئەگەر هاتووچۆمان بکردایا پارەی رۆژانەکەمان بەشی

---

١٠٩ - نەوسود، شارۆچکەیەکی رۆژهەڵاتی کوردستانە سەربە پارێزگای کرماشان، ٤٥کم لە باکوری خۆرئاوای شاری پاوەوە دورە.

١١٠ -پاوە شارێکە لە رۆژهەڵاتی کوردستان بەدوری ١١٢کم دەکەوێتە باکوری پارێزگای کرماشانەوە.

١١١ - لە ساڵی ١٩٩٢ حکومەتی عیراق بڕیاری کشانەوەی پارەی عیراقیدا و جۆرێکی دراوی ناوخۆیی خستە بازاڕەوە، بەهۆی ئەوەی پارێزگاکانی هەلێر و دهۆك و سلێمانی لەژێردەسەڵاتی عیراق نەمابوون و ئیدارەی هەرێمی کوردستان دامەزرا، چاپی سویسری دراوی عیراقی لە هەرێم بەکار دەبرا، چاپی ناوخۆیی عیراق کە بەپارەی تەبع ناسراو بوو لە پارێزگاکانی ژێردەسەڵاتی بەعس بەکار دەهات.

هاتووچۆکەی ناکرد. ئینجا ئەوە شتێ سەیر لەوێ روویدا لەوماڵەی ئیشمان ئەکرد پیاوێ ناسیاویان هاتبوو بۆ ماڵیان لە دویرەوە ئێمەی بینیبوو منی ناسیبووەوە، ناوی محەمەد بوو حەرەس بوو لە سجنەکەی دوبز، ئەها وتم یەك دوانێ لەوانەی حەویجە بۆمان باش بوون یەکێکیان ئەو پیاوە بوو. هات بۆ لامان ئیتر کە ئەومان بینیەوە ژنەکان زۆربەمان دەستمانکردە گریان، ئەو وایزانی ئێمە ئەترسین لەوەی بمانگرنەوە، کەوتە قسەکردن ئێوە خوشكو دایکی منن‌و مەترسن. ئەو نەیئەزانی ئێمە لە ترسا ناگیریاین، بەڵکوو کە ئەومان بینی هەموو رۆژگارە ناخۆشەکانی ناو سجن هاتەوە بەرچاومان‌و لەتاو جەرگمان ئەگیراین کە زۆربەمان لەوێ مناڵمان تیا چوو بوو.

خەڵکێ زۆر بووین ئەو ژنانەی لە شۆڕشەوە ئەچووین بۆ حەویجە، هەتا وەرز پەموو تەواو دەبوو دەماینەوەو کە ئیشیش نەما هەموومان پێکەوە بە کۆمەڵێك سەیارەی کۆستەر ئەگەڕاینەوە، ئەها بیرتان نییە ئەو ساڵە بوو کە بۆ بەدبەختی ئێمە لە گەڕانەوەماندا سەیارەکان دەعمیانکرد دوو کۆستەر پڕ لە ژن قوڕ کریا بەسەریاناو زیاتر لە نیووەیان هەر لەوێ مردن، هەنێکی شەل‌و شویت بوو بە نوقستانی مانەوە. هەروا کلۆڵ‌و بەدبەخت بووین وەرە بۆ پەیاکردنی نان بۆ مناڵ بگەرە حەویجە، لەگەڕانەوەیا خۆشی خۆشی هەریەکی شتێ پارەمان کۆکردۆتەوە بیدەینە دەست ماڵ‌و مناڵ لە رێگە بمریت‌و جەنازەکەت بێننەوە. لەوەوە خەڵکەکە ترساین ئیتر نەچووینەوە بۆ حەویجە، نازانم

قەدەر خوا بوو بەدەست ئەنقەست بوو، تەنکەر دای لە ریزێ پاسەکانمان زیاتر لە سی ژن مردن، هەمووی وەك من بەویەخت بوون‌و لە ئەنفال شەش حەوت مانگێك سجن بووین، منالّ بێ باوك‌و سەرگەردان بوو، نازانم بۆ نەگبەتی بەرمانی نادا، ئێستایش خەفەت ئەو ژنانە هەروا لە دلّمایە.

هەر ئەوکاتانە بوو دایك‌و باوکم لە ماوەی سێ رۆژ بەدوای یەکا مردن، ئەو ساڵە بوو کە هەڵبژاردن پەرلەمان کرا لە کوردستان[١١٢] وابزانم حەفتەیە ئەگەر هەشت رۆژ بوو نەورۆزمان کردبوو باوکم وەفاتیکرد، سێ رۆژ بەسەریا تێپەڕی‌و هێشتا هەر تەعزێی باوکمان هەڵنەگرتبوو دایکیشم وەفاتیکرد[١١٣]. دایك‌و باوکم دەستگیر نەکرابوون لە ئەنفالەکە بەلاّم ئەوەنە عەزابیان چەشتبوو بۆ کوڕو کچو نەوەکانیان، کە ئێمەیش هاتینەوە ئەوەنە بە حەسەرەتەوە چاوەڕێی کوڕەکانیان بوون‌و وا نزیك چوار ساڵ بوو هەر هەواڵیان نەبوو، نازانم دڵیان تەقی نازانم بەرگەی ئازاری چاوەڕوانیان نەگرت، ئەوە بوو هەردوکیان پێکەوە مردن.

مردنی دایك‌و باوکم بۆ من زۆر بە ئازار بوون، بەتایبەت کە هەردوکیان بەو جۆرە مردن، ئەوان بەهۆی ئێمەوە رەزالەتی زۆریان بینی‌و ئازاری زۆریان چەشت، ئەم چەند ساڵەش لە سجن گەڕابووینەوە دیوارێکمان بەین بوو، بەبۆنەی ئەوانەوە ئەوەنە خەم منالّم نەبوو ئەگەر لە مالّیش

---

[١١٢] -لە ١٩٩٢/٥/١٩ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان ئەنجامدرا.

[١١٣] -لە ١٩٩٢/٣/٢٩ باوکی کۆچی دوایکردووە، لە ١٩٩٢/٤/٢ دایکی کۆچیکردووە.

نەبوایام، بۆ ئێمە پشت بوون. بەرەی سێ کوڕیان ئێمەو منالّەکان، عەلیو منالّەکان، غازی برام هەر بابایان بووی لە باتی باوکیان بۆنی پێوە بکەن. بۆ ئێمەیش خۆشکەکانمو براژنەکانیشم، دایکم قەلاّ بوو بۆمان، بەلاّم دەسەلاّت چی بوو خوا هەر ئەوەنە بۆ ئێمەی هێشتەوە.

ماوەیەك بەبۆنەی تەعزێوە نەچووم بۆ ئیش، هەرچەنە ئەگەر رۆژێك ئیشم نەکردایا پێمانەوە دیاربوو، بەلاّم منالّەکان دوای دەوام مەکتەبەکەیان ئیشیان ئەکرد، کچە گەورەکەم وەریاننەگرد تەمەنی گەورە بوو، بیچکەلەکەیشم منالّ بوو هێشتا کات مەکتەبی نەبوو ئەوەی لە سجن لەدایکبوو ئەوەکان ترم ئەیانخوێند، تاقێ لە مەکتەب بون تاقێ بەدوای ناندا رایانئەکرد. داکیان کوێر بێ هەر لە منالّییەوە خەریك ئیش بوون نەحەسانەوە. نۆبەرەکەم پەخشان کچم تۆزێ لە کوڕەکان هەراشتر بوو هەر ئەو سالّەی وا دایكو باوکم مردن، مانگێ پێش ئەوە لەگەلّ هەنێ ژنو کچ گەڕەکەکەیا ئەچوون بۆ (کنگر) خۆیشم ئەوکاتە تەعزێمان تەواو بوو بوو ئەچوم لە کەرکوك ئیشم ئەکردو ئێوارە من گەیشمە بەرمالّ، جەنازەکەی ئەویشیان هێنایەوە بەرقاپی، لای مەنیلە[114] کە گەڕابونەوە لە تەرەکتەر بەربووبوویە خوارەوەو هەر لەوێ روحی دەرچوو بوو. وابزانم بیستو سێ رۆژ بوو دایکم

---

[114] - مەنیلە هەوارزێکە لە سەر رێگای سەرەکی نێوان شۆڕش – سەنگاو بە دووریی ٢کم دەکەوێتە باشووری خۆرهەلاّتی شۆڕشەوە.

مردبوو[115]. وەرە مناڵ بەو دەردەسەرییە بەختیوبکە، لە ئەنفالو لە سجن رزگاری بوو، لەرێی پەیاکردنی ناندا گیانی بەخشی. جەنازەم بینی ئیتر هەر ئەوە بوو روحم بەسەریا دەرنەچوو هارو شێت بووم، خەڵك گەرەك لێمان کۆبوونەوە گاورمان پێ موسڵمان ئەبوو، خوایەگیان ناشوکری نەبێ ئەم نەگبەتییە چییە رووی تێمانکردووە، کەمتر لە مانگێ ئەمە سێ کەسم لێبسێنیتەوە. دایكو باوکم هەرچۆنێ بوو بەشێ تەمەنیان کردبوو، بەڵام کچەکەم تازە پێی نابووە ناو سیانزە ساڵەوە، کچ گەورەم بوو دڵم پێی خۆش بوو، لەماڵ بوایا ئیش ئەو ماڵەی ئەکرد، ئەچوو بۆ ئەو دەشتە (کنگر)ی ئەهاورد، تەشی ئەرێسا لفکەی ئەچنی، بە (سوف) فانیلەی ئەستوری بۆ براکانی دروستئەکرد ئەیووت ئەچن بۆ مەکتەب با سەرمایان نەبێ، بەو منالییە خەمخۆر گشتمان بوو. درۆ نیە ئەگەر بڵێم لە هەموویشمان زیاتر بیر باوکی ئەکرد، لەسەر نان لەناو جێی خەو، رۆژ نەبوو بیرمان نەخاتەوە، ئەو چونکە لەوەکان هەراشتر بوو شتەکان زووی لەبیر بوو، بەسەرهاتی ئەگێرایەوە، باوکی هەرجارێ جلی بۆیان کری بێت میوەو شیرینیو ساردی بۆیان هێنابێ هەمووی لەبیر بوو، ئەها فلانە رۆژ باوکم وای ووت، بردمانی بۆ ماڵ مامە لە کەرکوك، لە دوکان شتی بۆمان کری. لە هەموویان زیاتر بە هۆڵ باوکییەوە بوو، هەتا مرد هەر بە تەما بوو ئەمرۆنا سبەی باوکی بێتەوە.

---

[115] - دایکی لە ١٩٩٢/٤/٢ کۆچی دوایکردووە، واتا لە ١٩٩٢/٤/٢٥ بەخشان کچی کۆچی دواییکردووە

باوکی ئەوەنە خۆشی ئەویست هەموو جارێ بەجیا خۆی جلوبەرگی بۆ پەخشان ئەکڕی، قوماشی جوانی لە کەرکوك ئەهاورد جلی کوردی بۆ ئەکرد، لەو کاتەوە ئەنفالەکەمان بەسەر هاتبوو جلی نەکڕی بوو هەر کۆنەی خەڵکمان لەبەرئەکرد، ئەو بەهارە کە (کنگری ئەفرۆشت) پارەکەی کۆکردبووەوە ئەیووت دایە ئەبێ ئەمساڵ بۆ نەورۆز دەستێ جلی کوردیم بۆ بکڕن، نەورۆز پارەکەی بایی ئەوە نەبوو بەش جلەکەی بکات، وتی قەینا دە رۆژ تر پارە کۆئەکەمەوە، دە رۆژەکە تێنەپەڕیبوو دایكو باوکم وەفاتیان کرد، سێ چوار رۆژێ نەچوو لەگەڵ هاوڕێکانیاو دوای تەعزێکە ئەویش لەگەڵ کچو ژنەکانا چووەوەو ئەیووت هەتا چلەی نەنکمو بابام ئەچێ هەر پارە کۆئەکەمەوە جل بۆ خۆمو خۆشکەکەیشم ئەکڕم، دایکی کوێربێ بەخوا بە پارەکەی خۆی کفنەکەمان بۆ کڕی.

ئەو ساڵانە بۆ ئێمە گەلێ زەحمەت بوو، بایەعییەکە وەك جاران نەما، هەنێ (مونەزەمە)[116] پەیابوون ئازوقەو یارمەتی خەڵکیان ئەدا، بەڵام ئەوەیش بە واسیتە بوو یەکێکت نەناسیایا ناوت نانووسرا، بۆ ئێمە نەبوو. جار جار لەم شۆڕشە شتیان دابەشئەکرد چەنێکی ئەگەیشتە

[116] - لە دوای ساڵی ١٩٩١ و بەهۆی کۆچڕەوی خەڵکی کوردستان و ئاوارەبوونیان بۆ ئێران و تورکیا، ئەنجومەنی ئاسایشی نێوودەوڵەتی بڕیاری ٦٨٨ دەرکرد بەو هۆیەوە بەشێك لە هەرێمی کوردستان وەك ناوچەی ئارام بۆ نیشتەجێکردنەوەی ئاوارەکان دیاریکرا، کۆمەڵێك رێکخراوی مرۆیی لە وڵاتە جیاجیاکانەوە هاتنە کوردستان، (مونەزەمە) وەك دەستەواژەیەکی میللی بۆ رێکخراوەکان بەکار دەبرا

دەست ئێمە دوو ئەوەنەی ئەخوریا، ساڵێك مونەزەمەیە تر هات زەوی لە جوتیار ئەم دێیانەی دەوروبەر شۆڕش بە کرێ وەرئەگرت ئەیکردە گەنمو جۆو ئەیدایە ماڵە ئەنفالەکان، ئەوەی دەستڕۆو کاربەدەست بوو لەم شۆڕشە نیوەی زیاتری ئەوان بردیان، هەمووی هەر غەدری لە ئێمە ئەکرد. بەڵام رێکخراوێ تر پەیابوو مانگایان ئەدایە ئەو ماڵە ئەنفالانەی کە دێیەکانیان ئازادنەکرابوو هێشتا هەر بەدەست سەدامەوە بوو، خوا هەڵناگرێ ئەوەی ئەو رێحراوە[117] بەر ئێمەیش کەوتو مانگایەکیان بۆمان کڕیبوو بە گوێلکێکەوە، بەخوا لە ئاوایی نەمابووین تێر ماستمان نەخوارد بوو هەتا ئەو رێکخراوە مانگاکەیان داپێمان، ئیتر ئەمووت هەر نانەکە هەبێت بە نانو ماست ئەژین.

ئەوەی منالێ هەراشی بوو باشتر بوو ئیشێکیان ئەکرد، بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە منالەکانی ورد بوون چونکە لە تۆپزاوا ئەوەی تەمەنی گەیشتبووە سیانزەو چواردە ساڵ بردیان، بەخوا ئەو سەلمەی خۆیشکمە سێ دانە کوڕی ئاوا گەنجی هەبوو بەدوای یەکەوە لەدایکبوو بوون (محەمەدو رزگارو شێرزاد) ئەوەنە جوان بوون دڵت ناهات تەماشایانبکەی، لەو تۆپزاوایە لێیان جیاکرانەوەو ئیتر ئەوەتا هەتا ئێستاش کەس نەیزانی لەکوێ کوشتیانیان. منالەکان من ورد بوون

---

[117] - رێکخراوی منالپارێزی بەریتانی بەهاوکاری رێکخراوی منالپارێزی کوردستان لە ساڵانی ١٩٩٦ بۆ ١٩٩٧ لەچوارچێوەی پرۆژەیەکی کۆمەککردن بە کەسوکاری ئەنفال ٦٦٤ مانگایان دابەشکردووە.

هەموو ئیشێکیان پێناکرا، خۆی ئیشیش نەبوو، دەبوو پەنا بەریتە بەر هەموو جۆرە شتێ تا نانیان بۆ پەیابکەیت. بەخوا ئەم منالآنەی من هەرچەند منالیش بوون پاکەت فرۆشیم پێیان کردووە، گولەبەرۆژە فرۆشی، گەراجێ بووی نەفەری بۆ کەرکوك ئەگواستەوە بەم رۆژگارە لەو گەراجە سینی بەسەر سەریانەوە بووە ئیتر هەنار بوایا، تۆك بوایا، پاقلە بوایا، هەرچی بوایا ئەیانکرد ئەمووت بەشکو بە هەمومان مەسرەفی رۆژانەی خێزانەکە دەرکەین. هەموومان ئیشمان ئەکرد هەتا توانیمان پارەی عارەبانەیە حەمالی بنەینە یەکەوەو عارەبانەیەکم بۆیان کڕیبوو بە هەرسێکیان ئیشیان پێی ئەکرد. سالەحو رەحمانو ئارام ئەو تاقەی مەکتەبیان نەبوایا ئەچوون حەمالیان پێئەکرد. دوای ئەوە ماوەیەك عەبدولڕەحمان نەخۆش بوو، بە تەینا نەیئەتوانی دلم نەئەهات بە تەنیا بینێرم دەبوو دایەمە سالەح یان ئارام لەگەلی بچوایان، چونکە ئەترسام ئەویش شتێکی لێبێ، گورچیلەیەکی وشك ئەبووەوە ئێستا یەك گورچیلەی هەیە. کە نەخۆش بوو پارەی دکتۆرو خەستەخانەمان نەبوو، مالی ئاوابێت دکتۆری بوو لە چەمچەمال ناوی دکتۆر( نەوزاد) بوو پارەمان نەبوایا، دەرزیو دەواکەی بۆمئەکڕیو ئەیووت ئەوە کەی پارەت بوو بۆم بێنەوە. چەند سال بەو دەردەوە ئەتلایەوە بەقەرز دەرزییو دەوامان بۆ ئەکڕی. دوای چەند سالێك رێکخراوێ پەیا بووی

چارەسەر نەخۆشیان ئەکرد وابزانم ئەیانووت (یابانین)[118] چوومە لای ئەوان ماڵیان ئاوابێ کوڕەکەیان برد بۆ سلێمانی، چەند جارێ هاتووچۆیان پێیکردو داودەرمانیان بۆمان ئەهێنا، هەر چاك نەبوو، دکتۆرەکان وتبوویان ئەمە ئەو کاتەی سجن بووە برسێتیو تینوێتییەکە وایلێکردووەو گورچیلەی وشك دەبێتەوە، ئەو مونەزەمەیە لەسەر حساب خۆیان عەمەلیاتیانکرد، خوا ئەو یابانییانەی کردە فریشتە بۆمانو لەوەوە نەجاتی بوو، پێشتر خەوو خۆراکی نەبوو. لە خوا بەزیادبێ ئێستا باشە، یەك گورچیلەی هەیە بەڵام ئەوەتا زەلامێکەو ئەتوانێ کارو کەسابەت بکا، هەرچۆنێك بێ نان منداڵەکانی پەیا ئەکا.

دوای کچەکەم ماوەیە زۆر کەوتم لەماڵەوە، حاڵیشمان هەتا ئەبوو خراپتر ئەبوو، بیرم ئەکردەوە خوایە گیان ئەبێ هەتا کەی ئاوا بەدوای نانا رابکەین، کەی دەرگای رەحممان لێئەکەیتەوەو زەلامەکانمان بگەڕێنەوە، ئەوکاتە کە خۆم ئەوەنە هیلاك بووم ئینجا بیرم ئەکەوتەوە کە باوك منداڵەکان چەند دەردەسەریی چەشتووە بۆ بەخێوکردنمانو ئێمە لەماڵ دانیشتبووینو پێمان نازانی، ئەمووت خوا بکات بگەڕێتەوە خۆم شانبەشانی کرێکاری ئەکەم. هەر نەگەڕانەوەو ژیانی ئێمەیش هەر زەحمەتتر دەبوو. ماڵێکی هاوسێمان هەبوو ناوی کاك (مستەفا) بوو خەڵك سەرقەڵا[119] بوو لای سەنگاو لەوێ ئیشی بۆم دۆزییەوە بۆ

---

١١٨ - رێکخراوی شنەبای ئاشتی یابانی (JPF)

١١٩ - سەرقەڵا گوندێکە ٤کم دەکەوێتە باشوری خۆرهەڵاتی شارۆچکەی سەنگاوەوە.

دەسکەنەی نیسکو نۆکو گوڵەبەڕۆژە رنین، هەرچەند دایکو باوکم لە ژیان نەمابوون، بەڵام خەسوم نەنك مناڵەکان هەر لە ئەنفالەکە گەڕابووینەوە لامان بوو، ئەوم شك ئەبرد بتوانێ چاودێری مناڵەکان بکات، ئارامم لەگەڵ خۆم بردو چووم بۆ سەرقەڵا، ئیتر بەپێی حاسڵاتی بەروبوومەکانیان لە بژارەوە لە دەستکەنەی نیسکەوە هەتا نۆك رنینو کاتی گوڵەبەڕۆژە رنینو کوتان و پاککردنی، تا خەلەو خەرمانیان تەواو بوو هەموو ئیشێکم ئەکرد، بە شان زەلامەکانەوە شەنم ئەکرد، کامان ئەکوتی، کام ئەکردە فەردەو کادانەوە. مانگی جارێ ئەگەڕامەوە رۆژێ لای مناڵەکان ئەبوومو ئەچووینەوە، یاخوا خوا چاکیان بۆ بکات هەر لەو ماڵە مامەوە هەتا ئیش ئەو ساڵەیان تەواو بوو.

بەو هەموو رەزالەتە ئەژیاینو بەو حاڵەوە شوکر بووین، لە یەك چاوە خانوویەکا سەر خۆمان کزکردبوو، شەڕ (ئاغاو مسکێن)[١٢٠] هەڵگیرسا بەهۆی ئەوەی ماڵ ئێمەیش نزیك ماڵ ئاغاکان بوو ئیتر ژیانمان نەما، ماڵە ئاغاکان یەکێکیان کوژریا بوو لەنزیك ماڵمان هەموو رۆژ ئەهاتنە گیانمان ئەبێ بێن شایەتی بدەن و بڵێن کێ کوشتویەتی. مسکێنەکانیش ئەهاتن تەقەیان لەوان ئەکرد ئەترساین ئێمەیش پێوە بین، خۆیشم چونکە هەر بەو دەشتو دەرەوە بووم بەدوای ئیشکردنا خەم مناڵەکانم

---

[١٢٠] - لە ١٩٩٢/٥/٥ شەڕی نێوان عەشیرەتی هەمەوەند و جوتیارانی ناوچەی هەمەوەند دروستبوو حەوت ساڵی خایاند و زیاتر لە سەت کەس تیایدا بوونە قوربانی، لە یادەوەری خەڵکی ناوچەکە بە شەڕی ئاغا و مسکێن ناودەبرێت.

بوو. ئەترسام شتێکیان لێبێت، بۆیە لەوێ بارمانکرد بۆ پیریادییەکان، چاوە خانووەکەی خۆمان فرۆشتو حەوت سەت دانە تاکە دینارم قەرزکرد خستمانە سەر پارەی خانووەکەی خۆمانو لە پیریادییەکان خانویەکمان کڕی. خوا ئاگادارە یەك ژوورێك بوو، تەنانەت ئاودەستو سەرشۆرکی نەبوو، هەروا هەنێ بلۆکمان نایە یەکەوەو بە چینکۆ سەرمانگرتبوو کردمانە ئاودەستخانەو سەرشۆرکێ. ئیتر متبەقیشمان نەبوو هەر لەو ژورەی لێی ئەخەوتین خواردنمان دروستدەکرد. بەڵام هەنێ دویرکەوتبووینەوە لەو تەقوتۆقە ئەوەنە ترسمان نەمابوو. بەڵام دوای ماوەیەك ئەوەنەی پێنەچوو شەڕی ناوخۆی پارتی و یەکێتیی هەڵگیرسیا[121] ئینجا ماوەیەك شەڕی ئەمان کەوتبووە ئەم شۆڕشەوە، بەشێکی بەدەست تەحسینەوە[122] بوو، بەشێکی بەدەست حەمەڕێگرەوە[123] تۆپ و هاوەنیان ئەنایە یەکترییەوە، خەممان بوو لێرەیش منالەکانمان نەبنە گوللەی ئەمانەوە یان گوللە تۆپێ بکەوێتە سەر ماڵماندا و منالێکم شتێکی لێبێت. باش بوو ئەوەنە زۆری نەخایاند دوای چەند مانگێ شەڕ لێرە دویر کەوتەوە. ئینجا خەفەتێ ترمان بۆ

[121] - لە ۱۹۹٤/٥/۳ لە قەڵادزێ شەڕ لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانی کوردستان دروستبوو.

۱۲۲ - تحسین شاوەیس فەرماندەی بەتالیۆنێکی پارتی بوو لە ڕۆژانی سەرەتای شەڕی ناوخۆ بەشی ڕۆژئاوای نۆردوگای شۆڕش (موەفەریی و قەرەنجیرییەکان)کەوتبووە ژێر کۆنترۆڵیانەوە.

۱۲۳ - حەمەڕێگر فەرماندەی هێزێکی یەکێتیی بوو بەشی ڕۆژهەڵاتی شۆڕش (پیریادی و قادرکەرەمیەکان) لەژێر کۆنترۆڵیاندا بوو.

پەیا بوو ئەیانووت مەسئولەکان مەکتەب منالەکان ئەڕوخێنن بۆ شیشەکەی و ئەیفرۆشن، دوو دانە مەکتەبی تازە و جوانیان لە گەڕەکی سەنگاوییەکان و لە قادرکەرەمییەکان روخاند[١٢٤] و شیش و دەرگاو پەنجەرەکانیان ئەفرۆشت، ئەترساین قوتابخانەکانی گەڕەکی پیریاییەکانیش بڕوخێننو منالەکانم سەرگەردان بکەنو نەتوانن خوێندنەکەیان تەواوکەن، هەرچەند ئیشیان ئەکردو هیلاك بوون بەڵام حەزیان لە مەکتەبەکەیش هەبوو ئەیانخوێند باش بوون، لە راستیا خۆیشم حەزم ئەکرد ئەگەر سواڵیشم کردبێ لە مەکتەب دەریان نەکەم، ئەمووت وەك خۆمان چارەنوسمان وابوو بەڵکوو خوا بکات ئەوان بخوێننو دواڕۆژێکیان هەبێ. بەڵام هەتا یەك دووساڵێکیش هەر ترسمان هەبوو مەسئولێ دەستبەسەر مەکتەبەکەیانا بگرێتو بیفرۆشێ، وەك چۆن ئەوەی قادرکەرەمیەکانو سەنگاویەکانیان[١٢٥] والێکرد. بەڵام

---

١٢٤ - لە ساڵی ١٩٩٤ بەهۆی بەرپابونی شەڕی ناوخۆ و لاوازبونی یاساو نەمانی چاودێری لەسەریان، بەهۆی هەلکوتانە سەر ماڵ و مولکی ئەندامانی یەکتریی ژینگەی ئەوە رەخسا هەندێ لە بەرپرسە لۆکاڵیەکان بکەونە تالانیو هەلپەی خۆدەولەمەندکردن، لەو چوارچێوەیەدا دەست بۆ مولکی گشتیش دەبرا، چەند قوتابخانیەك کە تەمەنی دروستبونیان بۆ ساڵانی ١٩٨٩ -١٩٩٠ دەگەڕایەوە لە هەردوو گەڕەکی قەرەنجیریو قادرکەرەمیەکانی ئۆردوگای شۆڕش روخێندران و شیش و دەرگاو پەنجەرەو تەنانەت بەردەکانی فرۆشران.

١٢٥ - قادرکەرەم و سەنگاو، دوو ناحیێی سەربە قەزای چەمچەماڵن، لە پرۆسەی ئەنفالدا روخێندراون و خەلکەکەی راگوێزراون بۆ ئۆردوگای شۆڕش، دوو گەڕەکی ئۆردوگاکە بەناوی ئەو دوو ناحیێیەوە نراوون.

وابزانم ژنەکەی مامەڕیشە[126] وتبووی ئەچم لای مام جەلال شکاتتان لێئەکەم، ئیتر نەیانوێرا ئەوانەی پیریاییەکان بڕوخێنن.

ئیتر هەرچۆنێك بوو بە کرێکاری و حەماڵی و بەهیلاکەت بەو وەزعەوە ئیدارەمانکرد بەڵام بە مەمرەو مەژی، هەتا مەعاشەکەیان بۆمان بڕییەوە، هەرچەنە ئەوکاتە مەعاشەکە کەم بوو، بەڵام بۆ ئەو زروفەی ئێمە زۆر زۆر بوو ژیانمانی لە مەینەتی رزگارکرد. بەخوا ماڵ هەبوو جەژناو جەژن مەگەر خێرەومەن کیلۆیە گۆشتی بۆیان کڕی بێت یان گۆشت قوربانی بۆ چووبێت منالەکانی گۆشتیان خواردبێ. بەڵام کە مەعاشیان داپێمان وەك ئەوە وابوو دەرگای رەحمەتمان لێکرابێتەوە. ماڵ بوویە لە ئەنفالەکەوە بە جلە کۆنەی خەڵك ژیاون هەتا ئەوکاتە، گەلێ مەینەتیمان چەشت، خۆمان گەلێك هیلاك بووین، منالمان کەساس و نەبوو زەلیل بوون. هەر ئەوەبوو خەڵکەکە هەمووی وەك یەك وابوو، ئەگەر وانەبوایا رەنگە منالمان بەو جلوبەرگ و پێڵاوانەی پێیانەوە لە روویان نەهاتایا بچونایەتە مەکتەب، بەڵام چونکە زۆربەی خەڵکەکە حالەکەی وابوو، بەو زەلیلییە ئیدارەمانکرد.

لەپاڵ ئەو نەبوونیی و هیلاکیی و هەموو نەخۆشیەشدا هەر چاومان لەڕێ بوو بەخوا نیوەشەو بایەکی قایم هەڵیکردایاو دەنگ قاپی[127] حەوشە بهاتایا، لە خۆشیا دڵمان دائەخورپا ئەمانووت ئیشەڵا هەواڵ

---

[126] - نیشتمان حەسەن هاوسەری مامەڕیشە، ماڵی لە پیریادیەکانی شۆڕشە لە چەمچەماڵ

[127] - لە هەندێ ناوچەی گەرمیان بۆ دەرگا، قاپی بەکار دەهێنن

زەلامەکانمانەو دێنەوە. بەم حاڵەو بە کوولەمەرگی ژیانمان دروستکردەوە، دوان لە مناڵەکانم خوێندنیان تەواوکرد، ساڵەحیش زۆر حەزم ئەکرد بیخوێنایا بەڵام کە شەشی سەرەتایی تەواوکرد نەیانهێشت زیاتر بخوێنێ چونکە تەمەنی گەورەبوو، زۆر حەولیشمان بۆیدا هەر سودی نەبوو. ئەبوو پارەیە زۆر بدەی بچیت مەوالێدی بیچك بکەیتەوە، بۆم نەکرا.

هەرچەنە خەڵکەکە نەبوو بووین‌و دەبوو بەدوای نانا رابکەین، بەڵام چونکە ئەوەنە زەحمەتمان بینی هەرچۆنێك بوو دەمانویست مناڵەکان پێبگەیەنین بۆ ئەوەی چارەنوسی ئەوان وەك خۆمان نەبێ، لە خوا بەزیاد بێ مناڵ ئەنفال لێی بووە دکتۆر بوونە مامۆستاو زۆرێکیان لەم دایەرەو شتانە ئیش ئەکەن، راستە ئێمە دایکی ئەم نەوەیەی ئەنفال زۆر ماندوو بووین هەتا توانیمان مناڵ گەورە بکەین، بەڵام شوکر بۆ خوا ئەوەنە زەلام‌و ژن چاك چاك دروستبووە لەناو کەسوکاری ئەنفال ئەتوانین شانازییان پێوە بکەین. ئەی بینیوتە زروفەکە چەند ناخۆش بووە خەڵك چەند خراپ پەیابووە، بزانە یەك مناڵ ئەنفال ئەبینی خراپ بێت؟ گشتی ئازایەتییەکەی بۆ دایکیان ئەگەڕێتەوە بەو پەتپەتی‌و نەبوونییەوە گەورەیانمان کردو پەروەردەیەکی جوانیش کراون. هەر ئەمانووت ئیشەڵا رۆژێك دێت باوکیان دێنەوەو ئەبینن مناڵمان ئاوا گەورە کردووە ئەبێ چەنێ دڵیان پێیان خۆشبێ، بۆ ئێمەیش دەبووە

روو سوری لەبەردەم پیاوەکانمان کە نەمانهێشتووە مناڵەکان سەرگەردان بن.

هەتا ئەوکاتەی پرۆسەی رزگاریی بوو کە ئەمەریکا هات بۆ روخانی سەدام[128]، بە درێژایی ئەو پانزە ساڵە ئێمە هەر چاومان لە قاپی بوو کەسوکارەکانمان بێنەوە، کە سەدامیش روخا چەند رۆژێك بەهیوا بووین ئێستا ئەمەریکا سجنە نهێنییەکانی سەدام ئەدۆزێتەوەو دەرگای زیندانەکان ئەکاتەوەو دێنەوە، بڕوا ئەکەیت تا چەند رۆژێك خەمی ئەم کەسوکار ئەنفالە ئەوە بوو کە ئێستا سەدام روخاوەو هێشتا سجنەکانیان نەدۆزیووەتەوە ئەمانووت کەس نییە نانێ ئاوێکیان باتێ لە برسا ئەمرن، چونکە هەر باوەڕمان وابوو لە ژیانا ماون‌و لەناو سجندان، بەردەوام خەومان پێانەوە ئەبینی کە لەژیاندان‌و هەموویان پێکەوەن و دەگەڕانەوە، کە سەدام روخیا دەبوو ئێمە لە هەموو کەس زیاتر دڵمان خۆش بوایا کە خۆی‌و دارودەستەکەی ئاوا بەزەلیلی کەوتبوونە دەست ئەمەریکا، بەڵام کە هەفتەیە تێپەڕیی‌و هیچ هەواڵێکی کەسوکارمان نەبوو، چەند رۆژێکیشی پێچوو لە تەلەفیزیۆنەکانەوە باس ئەوە کرا کە لە گۆڕی بەکۆمەڵ کوشوتیانیانە ئیتر بڕوا بکە ئەم شۆڕشەی تۆ ئەیبینی سەرپاك بووە تەعزێ، هەموو ماڵێك وەك ئەوەی جەنازەیەك چووبێتەوە بەر قاپییەکەی ئاوا بووین، چونکە هیوامان بڕا، نائومێد بووین، حساوکە لە هەشتاو هەشتەوە هەر بەو هیوایەوە ئەیاین کە لە

---

١٢٨ - ٢٠٠٣/٤/٩ لەناو کورددا بە پرۆسەی رزگارکردنی عیراق لە دەستی سەدام ناسراوە

ژیان ماون‌و هەر ئازاری چاوەڕوانیمان ئەچەشت، بەڵام کە سەدام روخاو کەس نەگەڕایەوە، وەك ئەوە وابوو ئەوکاتە کوشتبێتیانیان، خۆزگە هەر لە ئەوەڵ رۆژەوە کە ئەنفال کران بە خەڵکەکەیان بووتایا کە لە ژیان نەماون، ئەزانی چەند خێزان هەر بەهیوای گەڕانەوەی باوك‌و برایانەوە کچەکانیان بوونە قەیرەو شویان ناکرد، ئەیانووت با باوك‌و براکانمان بێنەوە ئەوجا شوو دەکەین. چەند دەستگیران بەو شێوەیە سەری سپی بوو بەدیار چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەستگیرانەکەیەوە.

کە سەدام روخا ئەوکاتە ئیتر ئومێدبڕاو بووین ئەگینا هەتا ئەو رۆژەیش هەر بە تەمای گەڕانەوەی زەلامەکانمان بووین. دوای ئەوە ئیتر هەر رۆژێ گۆڕێ بەکۆمەڵ دۆزرابێتەوە ئێمە برینمان دەکولایەوە، هەر جل و بەرگێ لەو تەلەفیزیۆنە پێشان درابێت، ئێمە ئەو رۆژەمان هاتۆتەوە بەرچاو کە لە هەردەکەی خوار ئاوایی لەیەك جیاکراوینەتەوەو جل و جامانەیانمان هێناوەتەوە پێشچاو خۆمان تا بزانین کەسوکارەکەی ئێمەن یان نا. هەرچەند دیمەنەکانی بە ئازار بوون بەڵام حەزیشمان ئەکرد بناسرێنەوەو ئەگەر ئەوانەی ئێمەن بیانهێننەوە لەم نزك خۆمانە بیانێژنەوە ئاوا جارجار بچینە سەر قەورەکانیان، بەڵام تا ئێستا ئەوەتا ئێمە هەر چاوەڕێین و چەند ساڵ جارێ وەجبەیەك دێننەوە، ئەترسم تەمەنی ئێمەیش بڕوات و بمرین و هەر نەیاندۆزننەوە. جاران لە ئاواییەکان مردووی یەکتری لەنزیك یەکتر ئەنێژران، ئێستا زۆر جار بیر ئەکەمەوە خەفەت لەوە ئەخۆم ئەڵێم ئەگەر هەتا لە ژیاندایین روفاتی

ئەوان نەهێننەوەو نەیانبینم، خۆ جارانیش نییە بڵێن با قەبرەکانمان نزیك یەك بێت تا ئەگەر هەرکاتێك ئەوانیان هێنایەوە هیچ نەلا پێکەوە لە قەورسانێك بین. خوا ئەزانێ ئەوان ئەدۆزرێنەوە یان نا، ئەناسرێنەوە یان نا، ئەگەر بیشیاندۆزنەوە ئەوان دەبەنە مۆنۆمێنتەکان ئەیانێژنەوە و ئێمەیش مەگەر خوا بزانێ چی بستە خاکێکمان بە نسیب ئەبێ. بەلام ئیشەلا خوا بەرەحم ئەبێ لەگەڵمان لە پاداشتی ئەو هەموو عەزاب و ناخۆشییانەی بەسەرمان هاتن، لەو دنیا یەك ئەگرینەوە. ئازاری هیچ شتێك وەك ئازاری لێکدابڕان نییە، لێك دابڕانێك کە نەزانی ئازیزەکانتان چارەنوسیان چی بوو؟ ئەو سەدامە زاڵمە بۆیە بەیەکجار هەموومانی نەکوشت تا ئەو عەزابە بچێژین، زۆرجار بیر لە هەڵەبجە ئەکەمەوە ئەڵێم ئەوان بەس نەبێ یان هەموویان پێکەوە مردن یان هیچ نەبێ ئەیانزانی ئەوە کەسوکارەکەیان مردن، خۆزگە ئێمەیش وابواباین و هەر یەکەم رۆژ هەمومانی بکوشتایا، زۆر باشتر بوو لەوەی پانزە ساڵ چاوەڕێ بکەیت و هەموو دەقەیەك وابزانی ئێستا هەواڵیان دێ. بەو نەبوونی و فەقیرحاڵییەی خۆمانەوە بە کرێکاریی و حەماڵی کوڕەکان پارەی تەلەفیزیۆنێ بیچکەمان نایە یەکەوە تەلەفیزۆنمان کڕی تەنها بۆ ئەوەی ئەگەر خەبەرێ هەبوو لە بارەی چارەنوسی کەسوکارەکەمانەوە گوێمان لێی بێت. هەموو شەوێ بەدیارییەوە دائەنیشتین کە هەواڵی ئەدا بەڵکوو خوایە هەواڵێ ئەو هەموو خەڵکەیشی تیابێت، هەواڵ هەر نەبوو هەتا سەدام مەحفەوە بوو، یارەبی لە قەبریشا نەحەسێتەوە وا وای لە ئێمە

کرد، ئەو هەموو ژن و منالە گوناحیان چی بوو وا ئێستا تەلەفیزۆن پێشانی ئەدا لە گۆڕی بەکۆمەڵ زیندەبەچاڵی کردوون، ئەی ئێمە چیمان بەسەر نەهات. ئەوەنە ساڵەی لە ئەنفالەکەوە ماویشینەتەوە عەزابی ئەو چاوەڕوانییە لەناو سجنەکە ناخۆشترە بۆمان.

سەدام مەحکەمە کریا هەموو رۆژێ بەدیار ئەو تەلەفیزۆنەوە دائەنیشتم سەیرم ئەکرد، ئەمووت بەڵکوو خوایە گوێم لە دوو شت بێت، یەکیان بزانم زەلامەکانمان لەکوێن و چیان بەسەرهات؟ دوای ئەوەیش ئەمووت بزانم نالێت بۆچی وام لەو خەڵکە کرد. ئاخریی هەر نەیووت. لە کوێ کوشتیانێتی یان بۆچی کوشتیانی. ئێمە چونکە خۆمان جەرگ سوتاو بووین و کەسوکارمان بەو شێوەیە تیاچوون بڕوا بکەن حەز بە مردنی کەس ناکەین، بەڵام وەڵا ئەوەنەی یەك دنیامان پێخۆش بوو پەتەکەیان کردە مل سەدامەوە، خۆزگا وەك ئەوەی تر نازانم برای بوو خزمی بوو کە پەتەکە ملی بڕییەوە[129]، خۆزگا سەدامیش ملی لەلەشی ئەکرایەوە. ئێستا جار وایە گوێم لێیە لەم رادیۆو تەلەفیزۆنانە خەڵك هەیە بە باشە باس سەدام ئەکات یان خۆزگە بەو رۆژانە ئەخوازێ کە سەدام حوکمی ئەکرد، ئەڵێم خۆزگا ئەو کەسانە بۆ یەك سەعات ئەهاتنە شوێنەکەی ئێمە تا بیانزانیایا ئەو قسانە چۆن وەك تیغ جەرگمان بریندار ئەکات. باشە وەك خۆیان نەهامەتیان نەدیوە و زوڵمی سەدامیان نەچەشتووە،

---

[129] - بارزان ابراهیم حسن تکریتی ١٩٥١، دایك برای سەدام حوسێن بوو لە ٢٠٠٧/١/١٥ لەکاتی جێبەجێکردنی حوکمی لەسێدارەدان، سەری لەلاشەکەی جیابووەوە.

ئەی تۆ بڵێی نەزانن وای بەسەر ئێمەیا هێناوە؟ ئێ خۆ ئەگەر نەشیزانن ئێمە چیمان بەسەرهاتووە، هەر نەبێ ناو ئەنفالیان بیستووە یان ئەزانن سەدام بە کیمیایی داوێتیی لە هەڵبجە، ئیتر چۆن دڵیان دێ وا بڵێن، خۆ ئێمە ناڵێین دەسەڵاتدارانی خۆمان هەموو شتێکیان بۆمان کردووە، لەم شۆڕشەین دوو حەفتە جارێك ئاومان ئەدرێتێ، هەتا نیوەی پێویستیەکانت پڕ دەکەیت دەبڕێ، کارەبا خراپتر، ئەوە چەند ساڵیش لەگەڵ بەغدا کێشەیان هەیە ئێمە باجەکەیمان داوەتەوە و موچەکەی ئێمە نادرێ. بەڵام کەس وەك سەدام نەبووە، ئەو زوڵمەی سەدام کردویەتی ئێوە خوێنەوارن توخوا لە هیچ وڵاتێکی تر تاوانی وا کراوە؟ تۆ وەرە ئەوەنە زاڵم بیت ئەو هەموو ژن و مناڵە و زەلامە بکوژیت، بێیت و بەناو ئیسلام و ئایەتی قورئانەوە بیکەیت. یەکەمجار کە هاتینەوە وتیان بە ئێوە ئەڵێن ئەنفال و لە قورئانەوە وەریگرتووە١٣٠، باوەڕم ناکرد، قورئان چۆن باس ئەنفالی تیایە؟ بەڵام ئێستا ئەزانم ئەم زاڵمە ئەیویست هەموو کورد بەو جۆرە لەناو بەرێت و بڵێت ئەمانە کافرن، بەڵام زوڵم بۆ کەس نەچووەتە سەر، خوا پێی نواند، ئەوە ئێمەین مناڵمان گەورەکرد و مناڵ ژنیان هێناو نەوەی تریان لێکەوتەوە، ئەی سەدام کوا؟ کوڕەکانی کوان؟ کچ و ژن و مناڵەکەی چیان بەسەرهات؟

---

١٣٠ ئەنفال ناوی سورەتی هەشتەمی قورئانە، لەسەر پێشنیازی (لیوا روکن کامل ساجد عزیز ئەلجەنابی) سەدام حوسێن پەلامارە سەربازییەکانی لە شوبات تا ئەیلولی ١٩٨٨ بۆ سەر کوردستان لە ژێر ناوی پرۆسەی ئەنفالدا بە هەشت قۆناغ ئەنجامدا.

راستە ئێمە مەینەتی زۆرمان بینی، ئازاری زۆرمان چەشت، بەڵام کورد هەر مایەوەو ئەوان لەناو چوون. راستە ئێمە بێکەس بووین و کەسمان نەبوو بۆیە وایان لێمانکرد، بەڵام خوا هەیە، ئیشەڵا ئەوەی زوڵم لەم کوردە بکات وەك سەدامی لێدێت.

ئێمە پێشتر دێیەکانمان کەوتبوونە ناوچەی موحەڕەمەوە، نەمانئەتوانی بچینەوە ئاوایەکان هەتا سەدام روخیا، دوای ئەوە ئەوجا سەیارەیەکمان بەکرێ گرت بۆ سەردان چوینەوە سۆران‌و لەوێوە چوینەوە بۆ مامشە، ئەوە منداڵەکان ئەزانن‌و لەگەڵم بوون هەر کە چوینە ئەو سۆرانە ئیتر وەك ئەوەی ئەو رۆژە ئەنفال کرابین من کەوتوومەتەوە شین‌و واوەیلاو لاوانەوە، چەنێ لە سۆران بوین‌و لەوێوە منداڵەکان دەستیان خستۆتەژێر باڵم بردومیانەتە مامشە، من هۆشم بەخۆم نەبووە. وامئەزانی ئەو رۆژانەیە کە مەینەتییەکانمان بەسەردا هاتووە. ئیتر هەتا ماوەیەك چاوم بەرایی نەئەدا نەمئەتوانی بچمەوە ئاوایی، ئەو ساڵە هەر نەچویمانەوە سەر زەویی و زارەکانیشمان، بۆ ساڵێ دوای هەندێ لە خزمەکان هاتنە ماڵێ و وتیان ئەو هەمو زەوییە گوناحە ئاوا بمێنێتەوە، خۆی کێشەی بۆ دروستکراوەو دراوون بە عارەب، وا ئێستا عارەبەکان خۆیان ناونویسکردووەو ئەڕۆنەوە بۆ وەتەن خۆیان، ئیتر بۆ یەکێتر دەست بەسەریانا بگرێت بچن خۆتان سەروکاری بکەن.

زەویزار و موڵکەکەمان زۆر بوو لەگەڵ منداڵەکان بڕیارماندا بەقسەی ئەو خزمێلە بکەین، لەو کاتەوە چوینەتەوە سەروکاری دەکەین، بەڵام

ئەوکاتە ئیمکانیاتمان نەبوو پێنج شەش ساڵێك هەروا لە شوێنی خانووە رمیاوەکە کەپرێکمان کردبوو ئەوکاتانەی دەچوینەوە مامشە بۆ ئیشوکاری کشتوکاڵی کە ئەماینەوە لەژێر ئەو کەپرە ئیسراحەتمان ئەکرد و نانمان ئەخوارد. بەڵام دوای شۆفڵمان لەشوێنی خانووەکەدا و کردمانەوە خانوو، کە شوێن خانووەکەمان پاککردەوە یەك کۆمەڵ ئەشیای ئەوکاتەمان لەژێر خانووە روخاوەکە بوو، لە پێڵاو جلوبەرگ، تەتکەوپەتکەی مناڵەکان.

ئێستا لە مامشە ماڵمان دروستکردووە خانووماڵێکی خۆش بەڵام هەر ئەوکاتانە دەچین کە بۆ سەروکاری جوت و کاتی درەوکردن پێویستە لەویٚ بین، ئەگینا بەیەکجاری نەچووینەتەوە ئاوایی. خۆ شوکر ئێستا کورەکان زەلامن بەڵام بەخوا هێشتا هەر دڵنیانین لەوەی چارەنوسی مامشە چۆن دەبێت، چونکە سەدام تاپۆکانی ئێمەی ئیلغاکردبووەوە و زەویوزارەکانمانی بە عەقد دابووە عارەب، هەرچەندە لەوەتەی سەدام روخاوە عارەبەکانیش چونەتەوەو جاریٚ وازیان لێمان هێناوە، بەڵام بەخوا عارەب متمانەی نییە هەر رۆژیٚ دەستیان بروات دێنەوە سەر ماڵ و حاڵمان. برۆ ئەو دێیانە ببینن هەمووی هەر وەك ئێمە وایە هەریەکی خانوویەکیان کردووەو ئاوا مەگەر بەهاران بۆ خۆشی و سەیران بچنەوە ناوی یان ئەوکاتانەی خەریکی تۆوکردن و هاوینان بۆ کۆکردنەوەی بەروبومەکەی بچنەوە. ئەو مامشەیە پێش ئەوەی بروخیٚ حەفتا ماڵ بوو، ئەگەر نەروخیایا ئێستا ئەم چەند ساڵە بەڵای کەمەوە دوو سیٚ

ئەوەنە زیادیکردبوو، ئێستا برۆ تەماشاکە بزانە چەند ماڵی تیایە. ئەوە باوە هەر حساوکە شارێك بوو، پێنج سەت دانە ماڵی تیابوو ئێستا هەمووی هەر کەلاوەیە، کێ چۆتەوە؟ خەڵکەکەیش گشتی وەك ئێمە هەر چاوەڕێن نازانم مادەی سەتو چەنە[١٣١] ئەڵێن ئەوە دەستورە بەوە چارەسەر دەبێت و بەیەکجاری دەبینەوە خاوەن زەویەکان خۆمان، هەتا ئەوە جێبەجێ نەکرێت هەر ترسمان هەیە هەر ڕۆژێك بێت جارێکی تر دەربەدەرمان بکەنەوە.

ئێمە هێشتا برینی ئەنفالمان خوێنی لێئەچۆڕێ، هێشتا هەر ئازار بۆ ئەو ئازیزانەمان ئەچێژین لە ئەنفال و بەهۆی ئەنفالەوە لە دەستمان چوون، چۆن دڵمان بێ جارێکیتر چارەنوسی ئەم منالێلەیەش بخەینەوە بەردەست چەقۆی عارەب.

کوردەکەیش خۆی کەمتەرخەمە تۆ بزانە عارەب هەر ڕۆژێ دەستیان بڕوات دێن بە زۆری زۆرداری زەویوزاری کورد داگیر ئەکەن و خۆیان ئەکەنە خاوەنی، ئێ کوردەکە ماڵ خۆیەتی و زەوی باوباپیرانێتی وازی لێهێناوە. حکومەتەکەی خۆیشمان زۆر خەمی ئەو خەڵکەی نەبوو ئەگینا ئەوە لەکەیەکەوە سەدام ڕوخاوە، عومرێکە، ئەیانتوانی دەست ئەو خەڵکە بگرن و لەشوێن خۆیان دایانمەزرێننەوە و لە مەترسی عارەبیش

---

[١٣١] - مادەی ١٤٠ی دەستوری عیراق کە لە ساڵی ٢٠٠٥ وەك دەستوریی هەمیشەیی پەسەندکراوە، بەپێی ڕێکارەکانی ئەو مادە دەستورییە لە چوارچێوەی ئاسابیکردنەوەی ڕەوشی ناوچە تەعریبکراوەکان دەبێ خاوەندارێتی ئەو زەویوزارە کشتوکاڵیانە بگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان.

بمانپارێزن. بەڵام کورد کوا ماوە هەموی بۆتە حیزب حیزب و هەر حیزبەیش هەر خەم خۆی و دەستوپێوەندەکەی خۆیەتی، کێ خەم لەو میللەتە ئەخوات. بۆیە ئیتر وا هەر بە کەساسی لەم ئۆردوگایانە ماوینەتەوەو چاوەڕێی رەحمی خواین، تەمەنیشمان وا رۆیی تازە ژیان بۆ ئێمە نەبوو، هەر خوا بکات پێش ئەوەی بمرین روهات براو کەسوکارەکانمان بێننەوە هیچ نەبێ وەك خۆیانمان بەزیندوێتی نەبینییەوە با چاومان بە کێلی قەبرەکانیانەوە بێت هەتا ئەمرین.



فێنك محەمەد ئەحمەد

لەدایکبووی زیندانی دوبز



پەخشان محەمەد ئەحمەد

کچی گەورەی نێرگز

زیندانیکراوی سەربازگەی

دوبز



غازی عەزیز بابا

ئەنفالکراو



عەلی عەزیز بابا

ئەنفالکراو



ئەحمەد حەسەن فەتاح

ئەنفالكراو



ئارام محەمەد ئەحمەد

زيندانيكراوى

سەربازگەى دووبز



بورهان ئەحمەد حەسەن، واحید نوری، نزار



بورهان ئەحمەد حەسەن، نوری حوسێن محەمەد



ئەوانەی ناسراونەتەوە لای راستەوە: عائیشە محەمەد،
حاجی ئەحمەد، ساڵح ئەحمەد، مام عەزیز



محەمەد ئەحمەد حەسەن، نەجمەدین حەمە عەلی، پەخشان محەمەد



لای راستەوە: کەریم محەمەد، نێرگز عەزیز بابا، عەلی
عەزیز بابا، جەیران عەبدوڵا، ناهیدە ئەحمەد حەسەن



عەلی عەزیز باباو منداڵەکانی: هەڵکەوت و سەرکەوت



عارف قوربانی، لە کاتی چاوپێکەوتن لە گەڵ نێرگز عەزیز بابا



عەبدولڕەحان، پەخشان، عائیشە، فێنک، ساڵح، ئارام

ساڵی ١٩٩٠ قادرکەرەمییەکان ناحییەی شۆڕش



سۆران غازی، هەڵمەت، ساڵەح، عەبدولڕەحمان، ئارام

ساڵی ١٩٩٢



محەمەد ئەحمەد حەسەن



عەبدولرحمان محەمەد ئەحمەد



ئارام محەمەد ئەحمەد

"کەس نەبوو منالێک و دوانی نەخۆش نەبێ، کەس نە بوو ترسی ئەوەی نەبێت ها ئەمرۆ ها سبەی بەسەر دەستییەوە رۆحی منالێکی دەرناچێت، تۆ وەرە بەو ترس و لەرزەوە، پێنج شەش مانگ پێنج سەت کەس بکەیتە هەر قاعەیەکەوە بەو گەرمای هاوینە، تینوو برسیان بکەیت چۆن نەخۆش ناکەون؟ منال گشتی وشکەوە بووبوون هەر ئەوەتا روحیان تیا مابوو، بەخوا منال وابووی تەنها پێستکەو ئێسقانەکانی مابوون هەموو بووبوونە قالۆرە ئەوەنە رەق و وشک بوو بوونەوە.

ئێ کاکە هیچ نەبوو بیخۆن ئەوەی شیرەخۆرە بوو دایکەکەی بایی ئەوە شیری تیا نەبوو منالەکە تێری پێبخوات، ئەوەشی شیرەخۆرە نەبوو هەراش بوون، نانەکە نەبوو بیخۆن".

نێرگز، ماماني ژنه دەستبەسەرکراوەکانی کەمپی دوبز

زنجیرەی (1) لە بڵاوکراوەکانی **دەزگای یادەوەریی کورد**